ئەبوبەکر مستەفا عەبدوڵڵا کۆیی

# دیوانی سارێژ

هەنگ

هەرگیزاو هەرگیز هەنگ لەهەوڵایە
ماندوو نەناسی لە ناخ دڵیایە
بڵێسەی پەخشی خامەی دەستتایە
کوردستان رووناکبوو پێی تامایە
(سارێژ) خاکەکەت لەرێز دایکتایە
بشمری جەستەت لە ئامێزیایە

بەرگی دووەم / هەولێر
2020

کتێب: دیوانی  سارێژ

نووسینی: ئەبوبەکر مستەفا عەبدوڵلا کۆیی

بابەت: شیعر

تایپ و نەخشەسازی: کۆمپیوتەری هیوا

تیراژ :   (        )  دانە

بەرگ: بەرگی دووەم

نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم / ۲۰۲۰

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (        )ی ساڵی ۲۰۲۰ ی دراوەتێ

# قازی محمد

٢٢ی/ کـــــــــــــــــــانونی دووی/٤٦
کۆمـــــار مهابــــاد واهاتـــــه جــــاڕدان

جـــاڕ درا کەئـــەم کۆمـــارە دامـــەزرا
بــۆ ڕۆژ هـــەڵاتی خـــاکی کوردســـتان

بـــــۆ بزوتنــــــەوەی ڕزگـــــاریخوازی
هــەموو کوردێــك بــوو لــەناو کوردســتان

ئـــــەم کۆمارەیـــــەش زو لـــــەناوبرا
قــازی گەییــە ڕێــز دەســتەی شــەهیدان

مانـــدوو نەناســـی ڕەنجـــدەری ژیـــان
نـــەژیا بـــۆ مـــردن، مـــرد لـــەبۆ ژیـــان

ئـــالای کۆششـــو هـــەوڵو خـــەیاتی
–قازی هەر رەنجبو، پێت ئەڵێم قوربان

ســەر مەشــقی ژیــنی قــازی بـۆ کوردبــو
دژ فارســــو عەجـــــەم، بەخــــەباتگێڕان

شـــەهیدە کەســـیٚ، لـــەپێناو مـــافی
لـــەپێناو مـــاڵو، ناموســـو، کیـــان

شـــەهید بـــیٚ ڕۆژیٚ، هـــەروەکو قـــازی
کۆتـــای ژیـــنی بـــیٚ، بەســـێدارەدان

کــوردی ئــازاد خــواز، لــەیادی نەکــەیٚ
ئەم کەڵە پیاوەی ، بەرز یکرد سەرمان

لــــــــــەمهابادا، لەســــــــــێداره درا
لــەپێناو ئــاڵاو، نەخشــەی کــورد زوبــان

هــــەزاران ســــڵاو، بـــۆ گیــانی پـــاکی
پێشــــەوا قـــازی، ســــڵاوی یــــەزدان

کــورد پێــێ ڕووســوره، پێـــێ دڵنەوایــە
هــــەردەم بــــەیادی، لەســــەر ڕوو جیهــان

بـــۆ یـادی نەکــەم، ســەرم پێــی بــەرزه
رووشـم پێــێ سـووره، لەهــەموو زەمـان

٢٠٢٠/١/٢٧

رۆژی دووشەممە

## سەربەستی

سەربەســـــتی هێمـــــای گــــەلێ هۆشــــیارە
کەســــــێ دوورە لێــــــی دڵ بـــــــەئازارە
سەربەســـــتی بەهاوســـــــەنگی دیـــــــارە
خـــــوێن بەخشــــین لــــەبۆی نـــەوەك بـــەپارە

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٦

## بۆ سەربەرزی

کـــــورد میللەتێکــــــە لـــــەبۆ ســــــەربەرزی
لەهەوڵــــــە دوژمــــــن لێیـــــا ئەلـــــــەرزی
لـــــەبۆ سەربەســــــتی خــــــەبات ئــــەگێڕێ
بـــــۆ شــــــکۆداری ئــــــاڵای بەبــــــــەرزی

هەولێر
٢٠١٧/٣/٢٩

## لە بۆ ئازادی

لــــــە بـــــۆ ئـــــازادی بکـــــەوە شـــــوونی
بکێشـــــــە ئـــــــازار وەشـــــــەونخونی
بەویســـــتی (خـــــودا) لـــــەم ڕێچـــــکە بـــــڕۆ
تـــــا خـــــۆت نـــــەبینی هـــــیچ بـــــەزەبوونی
ژیـــــن هـــــەوڵی ئـــــەوێ ئـــــازادیش خـــــەبات
شـــــەهیدیش نـــــاونووس ئـــــەکرێ بـــــەخوێنی
تـــــۆش فیـــــداکار بـــــە بـــــۆ ئـــــاڵا و لـــــەبۆ
ژینـــــی سەربەســـــتی کـــــورد و دەروونـــــی
ئـــــازادی ئەبتـــــە بەرهـــــەمی خـــــەبات
بـــــێ کۆشـــــش پـــــارووت ناکەوتـــــە ڕوونـــــی
کـــــورد میللەتێکـــــە ســـــتەملێکراوە
ژیـــــاوە هـــــەردەم زۆر بەنـــــەبوونی
هەڵســـــە خـــــەبات کـــــە کـــــوردی بەشـــــخوراو
بـــــۆ ســـــەرفرازیت بـــــڕۆ بەشـــــوونی
ئـــــەوەی کوشـــــتار و ســـــتەم لێـــــت ئـــــەکا
لەڕۆڵەکـــــەتا ئـــــەڕژێنێ خـــــوێنی
ئـــــەتۆش مەوەســـــتە مافـــــت پـــــیرۆزە
دژ بەســـــتەمکار وەلەناوچـــــوونی

هەولێر
٢٠١٦/١١/١٧

# كوردە

كــوردە بــۆ یەكــدی بەســۆز و ڕێــز بــی
لــەپێناو مافــت خــاوەن هەڵوێســت بــی
یــەكترتان لــەلا بەســەنگو پێزبــێ
لەئاســت بڕیــارت یــەك دەنــگ و ڕێزبــی
نــەك لــەئاژاوە بــەگوڕ و جــۆش بــی
كــوردە یــەك دەســت بــن یــەكتر بەرمــەدەن
بــۆ بەرژەوەنــدی یــەكتر زەڕ مــەدەن
بــۆ نەویســتی كــورد هــەر مەفــەر مــەدەن
بــۆ دوو بــەرەكی ڕێــی هــیچ كــەس مــەدەن
تــا دوژمــن بەغــەم هــەردەم پــەرۆش بــی
كــوردە بــۆ ناحــەز پووشــو ئاگربــە
بــۆ ســتەمكاران یــەك دەســت و گڕبــە
بــۆ پارێزگــاری گــەلت ســاتربە
بەرامبــەر دوژمــن چوســتو ڕێگربــە
تــاكو ناحــەزت پەســتو خــامۆش بــی
كــوردە هەوڵــدەن یــەكبگرن هــەردەم
بــۆ یــەكتر ببنــە نموونــەی ســەردەم
بــۆ كــاری یــەكتر هاوبــەش بــن بەغــەم
تــاوەكو دڵتــان لــێكتر نــەگرێ تــەم
وە بەســەربەرزی گــەل فــەرامۆش بــی
میللــەتی كوردمــان چوســتە دلێــرە
بەرامبــەر دوژمــن ئازایــە شــێرە

بـــــــەدوای ڕێــــــڕەوی ڕاســــــتیا فێــــــرە
بـــــــەنرخو ســــــەنگە لەئاســــــتی زێــــــڕە
لەســــــــتەمکاران نایــــــــەوێ خۆشــــــبێ

هەولێر
٢٠١٦/٦/٢٤

## خاکەکەت

خاکەکــــــەت چــــــاوەڕوانتە مەوەســــــتە
نەخوێنـــــدەوار بـــــی دڵیشـــــت پەســــتە
خاکـــــت دایکتـــــە پێتـــــا پەیوەســــــتە
تێبگــــــەی بــــــۆت هیوایـــــە، مەبەســــتە

هەولێر
٢٠١٧/٤/٢٧

## ئالآی کوردستان

ئـــــالآی کوردســــتان دروشمـــــە لــــەبۆم
دروشمــــــی خۆشــــیو شــــادییە لــــەبۆم
ڕێــــزدارە لــــەناو نــــاخی دڵــــی خــــۆم
بڵێســــــەدارە بــــۆم وەك گــــڕی مــــۆم

هەولێر
٢٠١٥/٣/١٨

## کوردی دلێر

هەڵسە ئەی کوردی چاپووکی دلێر
لەلانە وەرە دەرێ وەکو شێر
بوار مەدە بەناحەزی میللەتت
لەکلکە داری کا هێز و ڕوەتت
دەست درێژی بکا بەبیانوی ئەوەی
کەدۆستی کوردە وەدۆستی ئەوەی
ناحەز هەرچەندی لەبۆی ڕێککەوێ
ئەیەوێ کورد و نەوەی بخەوێ
بێ ئاگا بێ هەردەم لەپەنهانی
بژی لەژینێکی بەنەزانی
ژیان بەڕێکاوە دوا بکەوێ
بسڕێ ئارەقەی هەی پەشیمانی
کەواتە وەکو قەڵای پۆلا بە
پشتگیری کورد بە وەهەی ئالای بە
بۆ سەربەخۆیی گەل خۆ بەخت کە
خۆ وەك قەڵغانی بەرز و سەخت کە

هەولێر
٢٠١٧/٩/٢٨

# کوردی خۆخۆر

دار کرمـــی نـــەبێ بەرگـــەی ژیـــن ئـــەگرێ

کرمـــی لـــەخۆی بـــێ گـــەڵێ زوو ئـــەمرێ

بـــێ کـــرمیش هـــەزار ســـاڵ بـــەری ئـــەخورێ

کـــوردیش هـــەر بـــەکورد ناوەکـــەی ئـــەزڕێ

ناحـــەزی یـــەك بـــن! چـــیان پـــێ ئـــەکرێ؟

یـــەك پـــووش یـــەك نـــەوت زو ئـــاگر ئـــەگرێ

بـــۆ وان؟ زمانیـــان لێـــك ئـــەدەن لـــەجێ

هەنـــدە چـــین چـــین بـــن دواییـــان ئـــەبڕێ

بـــێ هیـــواش مەبـــە (ســـاڕێژ) پێـــت ئـــەڵێ

ورە و هیممـــــــەتت لەجەســـــــتە نـــــــەبڕێ

هـــەردەم دڵـــۆپ ئـــاو شـــاخێ کـــون ئـــەکا

کـــوردێکی ســـاغ بـــێ مەبەســـت پـــێ ئـــەدرێ

تـــۆ ســـاغ بـــە هـــەردەم بـــەئاوات ئەگـــەی

ســـاغ نـــەبی ناحـــەز چـــواردەورت ئـــەگرێ

هەولێر

٢٠١٧/١٢/٩

# کوردستان

کوردستان لەلام پشتە، خۆراکە
تۆزی خاکەکەی لەلاما داکە
بەخاکو ئاو و هەوای گەشەم کرد
لەجوانی کێو و کەژی چەشەم کرد
**کوردستان خاکتە لەسەری ئەژی**
خاك بۆ کورد دایکە وە ڕوەتیەتی
پاش مردن جەستەی لەباوەشیەتی
کەسەر بەخاکی کەم وەك سەرینە
پێی دڵنیامە و تۆ ورد ببینە
چۆن دایك ڕۆڵەی بەسك هەڵئەگری
پاش بوونی لەئامێزی خۆی ئەگری
لام بەم شێوەیە ئەم کوردستانە
دایکە لەبۆمان چاکی بزانە
بۆی بەئەمەك بە پارچەکی لەوی
لەسەریا ئەخۆی ئەژی ئەخەوی
کەواتە ئەڵێم ئەی نیشتمانم
متمانەی لەبۆم ئەی کوردستانم
بۆیە تۆم کردە سەرمەشقی ژینم
خاکت تیمار بو بۆ گشت برینم
تۆش هەڵسە ئێستا بەدوو دەنگما
تا بزر نەبێ لێتا ڕەنگما
دڵسۆزم لەبۆت دڵسۆزی لەبۆم

کوردســـــتانەکەم بڵـــێ کۆرپــــەی خـــۆم
دایکــــو رۆڵەینـــــە لـــــەبۆ یــــەکتری
پارچـــەکین لەیـــەك تـــۆ لـــەگوێی گـــری
ســـــاپێژی (ســـــاپێژ)ی بـــــۆ برینـــــی
چـــــونکە لـــــەلایا جـــــوانی، شــــیرینی
کۆتــــا دوانم دڵـــــم پێـــــت خۆشـــــە
بـــــۆ یــــەکتری بـــــوین بەجگەرگۆشـــــە

هەولێر
٢٠١٧/٢/٢٨

## شوانی بەرپرس

شـــــوان کەبەرپرســـــە بـــــۆ ڕانەمـــــەڕی
نابـــێ خـــۆی لێیـــا بکـــا بـــێ بـــەری
نـــەك لێـــی دوورکـــەوێ و گـــورگی تێبـــەردا
بـــۆ پۆســـتەکەی خـــۆی لـــەناویا بـــەری
شـــوان ســـووڕی بـــاوکی نوانـــد بـــۆ مـــەڕی
پێـــی گـــەورە ئـــەبی داینێتـــە ســـەری

هەولێر
٢٠١٧/٩/٢٩

# پارێزگاری ژینگە

پارێزی ژینگە ئەرکی پیرۆزە
بۆ هەموو کەسە و بۆ هەموو هۆزە
سیمای جوانی و ڕازاوەی شارە
لەگەشتوگوزار بەئاشکرا دیارە
دیمەنی سروشت لای هەموو کەسێك
پاك بێ دیارە، جوانە و ڕێکو پێك
پیرۆزبایی خۆم لەم کەسە ئەکەم
کەئەیپارێزێ، چ زۆر وەیا کەم
جوانی شار و دێ، پەیوەستە پێوەی
چەشە وەرگرە مەست ببە پێوەی
قسەی پیرۆزی سەروەرمان دیارە
لەسەر ناشتنی درەخت و دارە
نەمام ناشتنیش هێمای جوانی یە
بتوانی و نەیکەی ئەی سوودت چیە؟
بەشێوەی گشتی ژینگەپارێزان
خۆشەویستن لام وەلای میللەتان
کەژینگەت پاراست لام خۆشەویستی
دەست کەوتی باشت هێنامە دەستی
دیمەنی جوانی و خۆش تەندروستی
پێتەوە دیارە کەبۆی بەهەستی
تۆش ئەم گۆشەیە فەرامۆش مەکە
بایەخی پێدە و کار بەهۆش بکە

روخسـاری جـوانی و پـاکی و بۆنخۆشـی
لەژینگـه دیـاره، گـەر تێبکۆشـی
کەواتـه هـەردەم ژینگـەپارێز بـه
کـردەوە جـوان و لامـان بـەڕێز بـه
زبـر و خاشـاك و پاشمـاوەی پیسـی
کـەتۆ بـەجێت هێشـت نـەحس و نگریسـی
ئەمـەش بەئاشـکرا لەسـەیران دیـاره
کەخـەڵك ئەچـنه دەر لەبـەهاره
دە یەسـکت سـووك کـه ژینگـه پـارێز بـی
ئـەنجامی بـدە و تـۆ پـێی بـەڕێزی
پـاکو خـاوێنی لەباوەڕدایـه
نەکـەی لەدەسـتی دەی ئـەم سـەرمایه
کەژینگـەت پاراسـت وەرئـەگری چـێژی
ئەبیـه خۆشـنوودە و چـاوی (سـاڕێژی)
(خـوای گـەورە) پاکـه پـاکی خۆشـئەوێ
پـاکی جوانییـه تـۆش خۆشـت بـوێ
پـاك بـی بـاوەڕت بـەهێزتر ئـەبی
لـەلای هـەموو کـەس بـەڕێزتر ئـەبی
(خـوا) جـوان و پاکـه ژینگـەپارێز بـه
خۆشـنوودە و بـرا و دەسـتی (ساڕێژ) بـه

هەولێر

٢٠١٥/٥/١٥

# كەو

كەو لەناو مەلان زۆر یەسك سووكە
دەنووكی سوورە و لەشی بەتووكە
مەلێكە پێش چاو گەلێ جوانە
مەزارگەی جوانی لەناو دڵانە
دەنگی زۆر خۆشە كاتێ ئەخوێنێ
وەكو خۆراكێك بیر بەجۆش دێنێ
وەرە تەماشای پاڵ شاخەكان كە
سەیری دیمەنی مەل و كەوان كە
جوانی كەو لەناو گشتیان دیارە
روخساری لەتەك گوڵ و گوڵزارە
راوكەری عەوداڵ بەدوای ئەگەڕێ
لەبۆی ڕێگرە لەدەشت و دەرێ
كەوی راوكەران لەناو قەفەزدا
ئەخوێنێ بۆ وەی نەیدا لەدەستدا
مەبەست لەڕێگر برای ڕاوكەرە
ئەم پیشە مەكە، لەم دەشت و دەرە
پیشەكەت كارێ لەسروشت ئەكا
ڕوخساری سروشت، نادروست ئەكا
دیمەنی دەشتێ مەلە و، ڕوخساری
ئاژەڵی كێوی و گوڵ و گوڵزاری
گشتیان دیاری، پەروەردگارە
نەزان بێهۆشە، گەمژە و هەژارە

بـــــەڵام ئـــــەی راوکــــــەر ئەمـــــە جوانـــــە
کـــــەو و مــــــەلی تـــــر وەکــــــو ســــــامانە
چ کــــەو چ سووســــکە لەگـــــەڵ مــــەلی تـــر
مـــــەیان گـــــرە هـــــیچ کـــات، وازبێنــــە ئـــیتر
سروشـــــت هــــــەمووکات ژینگـــــە جـــوان ئـــــەکا
خــــۆی خۆشەویســـــتی، نـــــاو دڵان ئـــــەکا
گــــــەلێ بـــــــەزەقی گــــــەورەیی (خــــــودا)
لەسروشـــــــت دیـــــارە و نیشــــانمان ئــــەدا
جــــوانی ئـــــاژەڵی کێــــویش بــــێ لەمـــــەل
مەزارگــــەی دیـــــارە لــــەم تـــــەل و ئـــــەم تـــــەل
سروشــــــــتێك (خــــــودا) ڕازاندبێتیـــــــەوە
دەســــتکاری مەکــــە، هەڵســــە لــــەم خــــەوە
بـــــا ئــــــەم جوانیـــــە چەشــــــەی دڵان بــــێ
ببــــــێ بــــــەخۆراك لــــــەبۆ ژیـــــان بـــــێ
خـــــۆراکی دەروون هــــــەموو کــــەس ئـــــەی وێ
بــــــەدوای مەگــــــەڕێ بــــــۆ تێکــــدانی ئـــــێ
هەرشـــتێ ســــوودی هـــــەبێ بــــۆ گشــــت کــــەس
دەســـــــتی لێمــــــەدە و وازبهێنـــــــە بــــــەس

هەولێر

٢٠١٥/٦/٢١

## پەروانە واتە پەپوولە

باســـــی پەروانـــــە ئەکـــــەم هەنووکـــــــە
گیانلەبـــــــەرێکی زۆر یەســـــــك ســــــــووکە
قاچـــــــی باریکـــــــە تـــــــووك لێ ی ڕواوە
پــــەڕەی جــــووت بــــاڵی جوانـــــو نەخشــــاوە
چــــاو تیـــــژە وریـــــا جێـــــی ســــــەرگوڵاتە
مەزارگـــــــەی هـــــــەردەم لـــــــەناو دڵانـــــــە
ئـــــەفڕێ لـــــەگوڵێ بـــــۆ پـــــەڕی هـــــیتر
بێـــــزار نـــــابێتن هـــــەر ئـــــەڕوا ئـــــیتر
چـــــەند بڵێـــــی گورجـــــە چوســـــتە چـــــالاکە
لەبـــــــەر دڵانـــــــە دیـــــــارە وەپاکـــــــە
دڵگـــــر بێـــــڕادە لای مـــــن بەرچـــــاوە
خـــــــۆڕاگر ئـــــــازا هـــــــەروەکو لاوە
خۆشەویســـــتە لام وەلای هـــــەموو کـــــەس
هێمـــای گـــەورەیی و توانـــای (خوایـــە) بـــەس

هەولێر
٢٠١٦/١٠/٢٨

# گوڵ

گـــــوڵی نەپچـــــڕاو بــــۆن خۆشــــە گیانـــــە
ڕووخســـــــار ناســــــکو ڕەنگـــــی جوانـــــە
دەبـــــا دیمـــــەنی لێمـــــان تێکنـــــە چـــێ
تــۆش لێــی مەکــەوە و پێــی لــەق مەکــە جــێ
گشـــت دڵێکـــی تـــەڕ پێـــی مەســـت و شـــادە
هــــەر لێــــی تێـــر نابـــێ، بـــۆی بەئاواتـــە
بـــــەیادی کەوتمــــــە نـــــاو چـــــاوەڕوانی
کـــێ بـــۆی عەوداڵـــە؟ ســـەنگی ئـــەزانی
دڵ و چـــــاوم وا گەشــــــەی کـــــرد پێیـــــا
پێـــــی دڵنەوامــــــە و، تێــــــر نـــــابم لێیـــــا
نـــــــاوی جـــــــوانی لێوەشـــــــــایتەوە
ڕوخســـــــاری شـــــەنگی لـــــەبۆم مایتـــــەوە
هەربۆیــــــە دامنــــــا لەیەقــــــەی خۆمــــــا
چـــــونکە ئـــــەیبینم هـــــەروەکو مۆمـــــا
ڕوونـــاکی و جـــوانی گشـــت بەخشـــی پێمـــا
دەســــــتبەردارم بـــــو هــــــەرکات لـــــەڕێما
ئینجـــا تـــواوە خـــۆی بـــەخت کـــرد بـــۆم
گـــەر ئەمەکـــداربم نایخەمـــە پشـــت خـــۆم
گـــــوڵیش کەپچـــــڕا بـــــەس ڕەنگـــــی مـــــاوە
هەســـــت پێنەکـــــەری ســـــاویلکە و خـــــاوە
کـــەمن بـــۆنیم کـــرد خـــەیاڵم مەســـت بـــو
بـــۆ وەهـــای کـــرد بـــۆم؟ چـــونکە بەهەســـت بـــو

مـــۆم و گـــوڵ هـــەردووك خۆبەخشـــن بۆمـــان
بـــا ئێمـــــەش ئەمەكـــدار بـــین لـــــەبۆیان
ئەمانـــەی دیـــارین، (خـــوا) بەخشـــی پێمـــان
تـــا چەشـــە و خۆشـــی وەرگـــرین لـــەژیان
كـــاری (خـــوا) جوانـــە، لەجێگـــەی خـــۆیتی
ئـــەوەی پێـــی ئـــەڕوا، بەندایـــەتی خـــۆیتی
هـــــەموو بەهرەیـــــەك وەكـــــو ســـــەرمایە
پێمـــــان دراوە و دیـــــاری (خودایـــــــە)
دیـــاری (خـــوا) هـــیچ كـــات نایەتـــە ژمـــار
سوپاســـــگوزار بـــــە بـــــۆ (پـــــەروەردگار)

هەولێر
٢٠١٦/١١/٢٧

# باران

نـــاز و خۆشـــی ژیـــن بـــێ ژمـــار دراوە
بەئێمـــەی بەنـــدە پێشـــکەش کـــراوە
یـــەك لـــەم خۆشـــیانە ئـــەڵێم بارانـــە
کـــەخوا پێـــی داویـــن زۆر (میهرەبانـــە)
چـــاکەی (خـــوا) چـــەندی بـــیری لێ بکـــەی
لـــەژمار نایـــەن لـــەبیر خـــۆ نـــەدەی
بـــاران سەرچـــاوەی خۆشـــی ژیانـــە
ئـــەوەی تێبگـــا لای بێگومانـــە
پـــاش زســـتان بـــەهار ســـەوز خـــۆی نوانـــد
دار و درەختـــیش زۆر زوو خـــۆی ڕوانـــد
چەشـــنەها میـــوە بـــۆت پـــێ ئـــەگاتن
دەویەکـــە، ئایـــە کامیـــان ئـــەخواتن؟
زمـــان سەرســـامە لـــەتامی گشـــتیان
هەریـــەکیان تـــامی جۆرێکـــە بۆمـــان
یـــەك جـــۆرە ئـــاوە، میوەکـــان جیایـــە
تامیـــان نیشـــانەی گـــەورەیی (خوایـــە)
هەریـــەك تـــامێکی لێـــدێ مســـۆگەر
دە تـــۆش وریابـــە و وردبـــە لـــەم تـــەوەر
هەنـــدێکیان تـــاڵن، یـــا ترشـــن، شـــیرین
یـــا زیـــان بەخشـــن، ســـوود بەخشـــن لـــەژین
هەنـــدێکیان ســـوێرن، یـــان تفـــتن بـــرا
لای (خـــودا) پێمـــان درا هـــەڵبو چـــرا

چەندی لەباسی سوودی بارانا
بدوێم سەرچاوەی خۆشی ژیانا
بێژمار سوپاسگوزاری (خودام)
وەقەرزار بارم، لەمردن و ئێستام
(خودای) بەخشندە هەر چاکەکارە
کەسێ نایناسێ ژیانی تاڵە
باوەڕدار چەشە لەباوەڕ ئەکا
هەروەکو تامی خۆش لەبەر ئەکا
هەروەك بەلەشتا خوێن ئەسووڕێتن
ڕووەکیش بەئاو زوو گەش ئەبێتن
واتە ئاو ئێستا خوێنی ڕووەکە
ئەوەی نەزانێ لام بێ ئەمەکە
کەواتە گومڕا مەبە خواناس بە
گوێگری قسەم بە و دەنگوباس بە
گومڕا وەك ولاّغ ئەخوا و ئەژێتن
وەکو مالاّتە هەتا ئەمرێتن
لای هۆشمەند گومڕا گێلە و ئەڕێن
سەرسامم پێیا ئەبێ چی بێتن؟
کەسێ بەچاکەی (خودا) نەزانێ
ئەبێ چ کەس بێو وەچی بزانێ!
نەزانی نەفام سەرلێشێواوە
بۆیە لەکار و پیشەیا خاوە

هەولێر
٢٠١٨/٢/١٤

## مراوی

تەماشـــای مـــراوی کـــە چـــەندە جوانـــە
بەلەنجـــــــە ئـــــــەڕوا وەمەلەوانـــــــە
دەنگیشـــی خۆشـــە، بەچکەشـــی وایـــە
تـــەڕیش هـــەڵناگرێ، پەنـــدی زەمانـــە
چـــاو کـــراوە و دووڕوو ســـۆنەن تـــەڕ نـــابن
بـــەم پەنـــد و قســـەش پێـــی پەرێشـــانە

هەولێر
٢٠١٧/٨/١٦

## عەلی شیش

عەلیشـــیش مـــەلی بـــەرز و مـــل درێـــژە
بـــێ ئاگـــا ئـــەڕوا وەلەســـەر تێـــزە
بـــەراورد نـــاکرێ لەگـــەڵ مراویـــدا
بـــۆ (خـــوا) نیشـــانەی گـــەورەیی و هێـــزە
دەنگـــی ناخۆشـــە لـــەلاما گێلـــە
لـــەڕاکردنا وەك کـــەری دێـــزە
لـــەمالات حوشـــتر لەمـــەل عەلیشـــیش
بڕوانـــە لێیـــان ســـامیان بچـــێژە

هەولێر
٢٠١٧/٨/١

## کەڵەشێر

کەڵەشـــــێر هـــــەموو لەشـــــی نەخشـــــاوە
ســـــەروبن گـــــەردەن ســـــوور وەك لغـــــاوە
بـــــانگ و قووقەكـــــەی لـــــەگوڕ و تـــــاوە
بـــــۆ مریشـــــكان شـــــوانە كـــــەدێ لـــــەم لاوە

هەولێر
٢٠١٧/٨/١٦

## نەمام

روخســــار شــــیرینە و بەهاشــــی بــــەرزە
دیمــــەن جــــوان و ســــوودبەخش و تــــەرزە
ســــەنگی جــــێگیرە لــــەناو دڵانــــدا
چوســــتو چــــالاكە مــــاوەی ژیانــــدا
شــــنە شــــنی دێ بەشــــنەی بــــاوە
پــــەروەردەكراوی خاكــــە وەئــــاوە
شــــەنگە ناســــكە لــــەلام وەك لاوە
بەربەخشــــە بۆمــــان نەسســــتە و خــــاوە
گــــازی ئۆكســــجین ئەبەخشــــێ بۆمــــان
تــــۆش داینــــێ بەدەســــتكەوتێكی خۆمــــان
بــــۆ خزمــــەت مــــن و تــــۆوە ڕەخســــاوە
وەك دیــــاری پێشــــكەش بەئێمــــە كــــراوە
لــــەلای (خــــوای گــــەورە) بــــوە بــــەدیاری
لام تــــەواو نابــــێ سوپاســــگوزاری
تــــۆش ئەگــــەر مــــەرد و دلێــــر و ژیربــــی
ئــــەبێ (خــــوای گــــەورەت) هــــەردەم لــــەبیر بــــی

هەولێر ٢٠١٧/٢/١٨

# گوڵەباغ

گوڵەباغ گوڵی بۆنخۆشە جوانە
لەلام شیرینە لەناو دڵانە
روخساری لەپێش چاوم ناسکە
وەکو ئەیبینم لام وەك ئاسکە
کاتێ خونچەیە بۆم دڵڕفێنە
تۆش خۆشت بوێ هەڵسە بیچێنە
تامو بۆنیشی لەناو چا خۆشە
چای بۆندار تێکە و ئەتۆش بینۆشە
کەواتە ڕاستم کە عەوداڵبم بۆی
شایانە بیدەم بەجگەرگۆشە
تێر نابی لێیا لەچەشەی خۆشی
لەجوانی پەڕی کەڕووی پێ پۆشی
لەخونچەییدا قەشەنگە پێش چاو
کەبو بەگوڵیش ئەیبینم وەك لاو
ئەڵێ لای هەموو کەسا شیرینم
منیش لەهەوڵم تاکو بیبینم

هەولێر
٢٠١٧/٥/٢٤

# گوڵە هێرۆ

ئەی گوڵە هێرۆ گوڵە هێرۆی سوور
گەش و ڕۆشنی لەنزیکو دوور
بەسەر لاسکەوە دیاری وەك گەنجی
بەجموجۆڵی لەهەولو ڕەنجی
کەدوورم لێتا لەڕوخساری تۆ
لاسار و سستم وەکو ڕەنجەڕۆ
بەسەر لاسکتا چەماوی جوان
ئەنۆڕیە زەوی بەسووکو ئاسان
هەرچەندی بڵێی دڵگری لەلام
دڵڕفێنی بۆم لەکۆتا ئەنجام
کەسێ نەویستە هەر وایە بۆتا
دایمەنێ بەهەند بەهەستی خۆتا
لەسوور و گەی بۆم گوڵ بەزێنی
لەشەنگو شۆخیت دڵ ئەتەزێنی
لەعەشقی تۆیە دڵ مەستە لەبۆت
تۆش پێ بزانە مەیدە لەدەست خۆت
تۆش ئەم گوڵەیە بکە هاوەڵ خۆت
پێشکەشی بکە جوانی و ڕەنگو ڕۆت
لەناسکیتا جوانی پێش چاوم
عەودالم لەبۆت لەبۆت لەڕاوم
قەف قەف پەڕەکەت بازنەیی دیارە
جوانی تۆ دیاری (پەروەردگارە)

کەســـــێ دوورە لێــــــت لــــــەش بــــــەئازارە
لەپەرســـــتی و غوربــــەت لـــــەخۆی بێــــزارە
بـــــەجوانی و شـــــەنگی و قەشـــــەنگیت مەســـــتم
کـــــارێکی واتکـــــرد لەســـــۆز و هەســـــتم
ئـــــیتر بـــــەجوانیت مەســـــت بـــــو خـــــەیاڵم
یـــــادی دووریتـــــــە ئـــــــەدا لـــــــەباڵم
دڵ ئـــــــاوێزانی دیـــــــدەی قەشـــــــەنگتە
عاشـــــقو مەســـــتی ڕوخســـــارو ڕەنگتـــــە

هەولێر
٢٠١٧/١/٢٤

## گوڵە نێرگز

ئەی گوڵە نێرگز نرگزی جوانم
مایەی شانازی و خۆشی ژیانم
گوڵی ڕازاوەی قەشەنگی بەهار
ناوەرۆك زەردی پەڕ سپی دیار
ئەی لاسك سەوزی ناسكی بۆنخۆش
خەیاڵی كەسی دڵتەڕی بەجۆش
وەرە بتبینم خەو ڕەوێنەری
قەڵاچۆی دەرد و غەم پەڕێنەری
خەیاڵ خۆشكەری هەموو كەسانی
مایەی خۆشبەختی شادی جیهانی
ڕووم تێكە تاكو بۆنت بۆم بێتن
وەكو بەبەغا هۆش بجولێتن
سەیركە ئێستا پارێزی ئەكەم
لەهەڵوەرینت تا دووربم لەغەم
(سارێژ) بەیادی نرگزی بەهار
نەشونمایكرد دانینا بەزار

هەولێر
٢٠١٩/١/١٦ چوارشەممە

## ماسی

گیانلەبەرێکە بێ دەستو لاقە
پەڕ لەشوێنیتی لەبۆی چاکە
لەش قەشەنگ بەپوولەکە پۆشراوە
بۆی بویتە پۆشاك جوان پیشاندراوە
کیسەیەك هەیە لەناو سکیدا
پڕ هەوای ئەکا لەسەرکەوتندا
بناو لێئەدا لەقووڵی ئاوا
بەشارەزایی (خوا) وای داناوا
هەر کەهەستی کرد ڕاوچی دوای ئەڕوا
لەتەنکاو ئەڕوا هەتا نەخوراوا
ئەم گیانلەبەرە هەوای تەواوە
لەئاو وەرئەگرێ تا لەژین ماوە
بێتە سەر زەوی و وشکایی ئەمرێ
لەبەروەی هەوای تەواوەی لێئەبڕێ
لەم کاتە یەکسەر زوو ئەخنکێتن
کۆتا بەژینی دێتو ئەمرێتن
ئەم گیانلەبەرە لەئاو بێوچان
هەر بێزار نابێ تا مایتی ژیان
گۆشت خۆشو نایاب بۆ لەش تەندروست
ماددەی خراپ لەلەش زوو دەرئەکا گشت
فرۆکەش لەشێوەی وی دانراوە
بەئاسان ئەفرێ زوو لەپڕ تاوا

لمـــــوزی تیـــــژه تـــــا هـــــەوا بـــــبڕێ
بەمەبەســـــت ئـــــەوەی بەئاســـــان بفـــــڕێ
لەشـــی ڕەخســـاوە زۆر جـــوان بـــەم شـــێوە
هونـــــەر و لێهـــــاتووی (خـــــودای) پێـــــوە
ئەمـــەش دەســـتکردی (خـــودای گەورەیـــە)
دان نـــێ، بـــەتوانای (خـــوا)، بـــەم بەڵگەیـــە
ئـــــەم دڵۆپەیـــــەش، لـــــەزەریای بـــــێبن
بەڵگـــەی گـــەورەیی (خوایـــە)، مەیکـــەون
پێغەمبـــــەر یـــــونس، کـــــەحوت قووتیـــــدا
ترســـــا وە ڕایکـــــرد ئـــــارامی نـــــەما
نـــەی کردبـــا زکـــری، (خـــوا) بـــێ کۆتـــایی
لـــەزگ حـــوت ئـــەما، تـــا ڕۆژی دوایـــی
(خـوا) فـەرمانی خـۆی، بەسـەر حـوت سـەپاند
کـــەیونس فڕێـــدا، کـــاری بـــۆ ڕوانـــد
لـــەبیری نەکـــەی، (خـــوا) باڵادەســـتە
کەســێ هەســت نــەکا، گــومڕا و بــێ هەســتە
بـاوەڕت چـۆن بـێ، بـە (خـوای) باڵادەسـت
دێتـــەوە ڕێگـــەت، ئەگـــەی بەمەبەســـت
(خـــوا) لـــەدایکو بـــاوك، بـــەزەیی تـــرە
لەئاســـت فـــەرمانی (خـــوا)، بەنـــدە کـــڕە
ســـەر دانوێنـــە و، کوڕنـــوش بـــۆ (خوایـــە)
بەنـدەی (خـوا) (سـاڕێژ) چـۆن ئـەڵێ وایـە

هەولێر

٢٠١٩/٣/١٥ هەینی

## سۆنە

تــــۆ وەك كەســـــێكی ڕوو قــــایم وابــــی
پێـــت ئــــەڵێن وەك ســـۆنەیە تــــەڕ نــــابی
كەســــێ خــــراپیش بــــێ كــــەخۆی پێچــــابی
دیــــارە مراوییـــــە لــــەئاو تــــەڕ نــــابی

هەولێر
٢٠١٧/١١/٢-١

## زرینگ

بــــەلای مــــن كەســــێكی زرینگــــە وایــــە
كــــەكاری ژینــــی لــــەلای ســــانایە
كەســــێكی زیــــرەك پــــەی بــــەوە ئــــەبا
كــــاری جــــوان بكــــا تــــا گیــــانی مایــــە

هەولێر
٢٠١٧/١١/٢-١

## گەمژەڵ

گەمــــژەڵ بــــۆ نــــاوت ڕۆیــــی بەگەمــــژەڵ؟
چــونكە تەمبــەڵ بــوی كاتــێ هــەت بــو هــەل
گەمــژەڵ بــەدۆی خــۆی هــەر ناڵــێ ترشــە
لــــەپاش شكســــتیش ئــــەگرێتن گێچــــەڵ

هەولێر
٢٠١٧/١١/٢-١

## پێپلكە

كەســـــێ بگاتـــــە بـــــەرزی بەهـــــەنگاو
وەك ســـەر پێپلكـــە بـــەرز ئـــەبێ تـــاو تـــاو
چـــــــونكە قادرمـــــــە پلـــــــە بەپلـــــــە
بـــــــەرزت ئـــــــەكاتن هەوڵـــــــدە ئـــــــەیلاو

هەولێر
١-٢٠١٧/١١/٢

## (١) پێنووس

تۆماركـــــــــەرێكی ڕووداو پێنووســـــــــــە
بـــاوە لـــــەلامان كـــــەوا ڕاســـــت نووســـــە
خامـــــــەش درێغـــــــی ناكـــــا لەئاســـــتی
دادوەری لـــــــــــــەواتای تیژەمووســـــــــــە
هـــــــەر گوزوشـــــــتەكی ببیـــــــە و ببینـــــــێ
چـــــبی ئەینووســـــێ دەم تیـــــژ و لووســـــە
كەواتـــــــە ئێســـــــتا زانـــــــیم كەڕاســـــــتە
خامـــــە ڕێـــــزدار بـــــو بـــــۆ؟ ڕەوا نووســـــە

هەولێر
٢٠١٧/١١/٣

## (٢) خامە

هەرچـــــــەندی بڵـــــــێی خامـــــــە پـــــــیرۆزە
ڕێپیشـــــــــــاندەری ئێمەیـــــــــــە و هـــــــــــۆزە
پێنووســـــــە مایـــــــەی خۆشـــــــیو شـــــــانازیم
ڕێـــــــــزدارە بۆمـــــــــان هـــــــــەردەم بەســـــــــۆزە

هەولێر ٢٠١٧/١١/٣

# بەراز

بـــــەراز ئاژەڵــــــە چـــــۆن ئاژەڵێکـــــــە!
ئـــــــاژەڵێکی وایــــــــە کەناڕێکــــــــە
بــــەتوانا و هێـــــزە لـــــەبۆ زەڕ بەخشـــــین
بـــەری بوســـتانیش تێــک ئـــەدا چـــین چـــین
مـــــــاڵوس لــــــــەباغا بەجموجۆڵـــــــە
هۆشـــــیارە لـــــەناو ئـــــەم خـــاکو خۆڵـــە
لەشــــی بخـــــورێتن خـــــۆی ئــــەخورێنی
– بـــــەداری بـــــەری، بـــــەر ئـــــەوەرێنی
برینـــــــداری بکـــــەی، خــــــۆت بپـــــارێزە
زەڕت لێئـــــــــەدا، بـــــــەتوانا و هێـــــــزە
کەواتــــــە ئـــــەڵێم، مـــــاڵوس کــــــوژەرە
بـــــۆ تـــــۆ و باغەکـــــەت، زیـــــان و زەڕە
کەهەڵچـــو وریـــای خـــۆت بـــە لێـــی دووربـــە
تـــا... دووربـــی باشـــە، لـەڕای خـۆت سـوور بـە
چـــونکە بـــت گاتـــێ پـــەل پـــەلت ئـــەکا
ئـــــاژەڵاتی خــــۆی لــــەم کاتــــە ئـــــەکا
باغـــــەوان گــــــوێ خــــــۆی لێ ئەباتـــــەوە
بـــــــەراز ناتوانـــــــێ ئـــــــاوڕ داتـــــــەوە
وریـــــــابی باشـــــــە لەهەڵســـــــووکەوتا
بـــــەرەنگارت بـــــێ، وەك پووشـــــو نــــەوتا
خـــــۆت بەرامبـــــەریا بــــــەفیل مەزانــــــە
گیـــــــانی تۆڵەســــــــاندنی بەژانــــــــە

**سماقوڵی سەروچاوە**

**٢٠١٩/٨/٢٩**

## دورگەی ئەمیرە

ئیمڕۆ لە ١٦ی ٩ چووین بۆ دورگەی ناوبراو لەناو دورگەی ئەمیرە
بەندە سوپاسی (خوای) کرد کەپێی دام چارەسەری باش (سارێژ) أمیرە
بەڕێم کرد ماوەی ٢٠ ڕۆژ بەخۆشی لەگلستانیدا خۆشیم نۆشی
لەئەستەمبۆلا بەئاو و هەوای گەشەم کرد دڵیش بۆی تێدەکۆشی

ئەستەمبۆڵ

٢٠١٨/٩/١٦

## کاری خوا

لە ٧ی ٩دا ساڵی ٢٠٠٠ لەگەڵ ١٨ دا بارانێ (باری)
ڕۆژی هەینی بو کەزەییی (باری) هاتە سەر زەوی بۆ خاکو داری
لای هەموو باوەڕدارێ دیارە کەتواناى (خودا) بەسەر گەردوونا
دەسەلاتدارە لەگشت شوێنو کات بەسەر گشت گیاندار کەبۆی دەناڵی
بۆ پێی هەڵنەڵێم بەگۆپارەکەم کەپێی ئەڕۆییم لەپێویستیدا
بوە کەسووکارم لەکاتێکی وا لەتەنیاییدا وەك مامو خاڵی
من لەتورکیادا لەئەستەنبولا ئەچووم بۆ نوێژی هەینی بەداری
داری من هەردەم گۆپارەکەم بو لەبۆم بوە هاوڕێم بەدڵوزاری

ئەستەنبۆڵ

٢٠١٨/٩/٧

## بوێری

ئـــەم کەســـەی کـــەوا لـــەم گۆشـــە بـــوێرە
دوڕو، مــــــرواری و، یــــــاقووت و، زێــــــڕە
دان بــــەخۆ گــــرتن لــــەبواری (ئــــەدەب)
بەهــــەردوو واتــــای مەســــتە وەتێــــرە

**راڤە:**

هەردوو واتاکەی وشەی (ئەدەب) ئەمانەی خوارەوەدا:

واتای یەکەم: ئەم کەسەیە کەبەئەدەب و بەشەرم و حەیایە.

واتای دووەم: ئەم کەسەیە کە کەیفی بەهونەری (ئەدەب) و (ادبیات) دێ.

هەولێر

٢٠١٥/٧/١٢

## ناپەسند

کەســـــی ناپەســـــند لـــــەلام وا دیــــارە
لەهەڵوێســـــــــتیدا گـــــــــەلێ زۆردارە
بـــــەرەو ڕووو لـــــەبۆت دۆســـــتە وەیــــارە
لەکردەوەشـــــــی پێــــــت شــــــەرمەزارە
ناپەســــــند هــــــەردەم لــــــەلام وەك مــــارە
لەهەڵوێســـــــــتیدا کـــــــــە نالـــــــــەبارە
لــــەپێش چــــاو دۆســـــتی ئێســـــتایە و (پـــارە)
دەســــتی بـــــێ ئـــــەتکا (بـــــەپارە) (پــــارە)
کـــــاری ناپەســـــند ڕەنـــــگ ئەداتــــــەوە
لـــــــــەڕقو کینـــــــــی وەك برینـــــــــدارە
خـــــۆی نیشــــان ئــــەدا بەدڵســـــۆزی تـــــۆ
گوایـــــــە کەســـــــێکە وەك کەســـــــووکارە
ئەمــــــەش ئەبێتــــــە کۆتــــــا نیشــــــانەی
دووڕوویـــــــــی و بــــــــەدی لــــــــەزمان لارە

هەولێر
٢٠١٩/٥/١٥ چوارشەممە

## سپێردراوی كار

هەیـــە فـــەرمانی پێكـــەی پێـــی بڵێـــی[1]
ئەمـــە ئەنجامـــدە ناپرســـی كـــە كێـــی
لـــەم ئیشـــو كـــارەی كـــەوا بـــۆت ئـــەكا
لـــــەلای ســــوغرەیە وائـــــەزانێ پێـــــی[2]

(١) وشەی پێی: وشەكە بۆ پێ گوتن بەكاردێ.

(٢) وشەی پێی: وشەكە گوایە بەقاچ و پێت ئەزانی.

## بێ ئەمەكی

رەگەزدۆزی و لێكچوون (الجناس والطباق)

بزانـــە داری بـــەر كـــە بـــەر ئـــەگرێ[1]
بـــەردی بـــۆ بـــاوێ لەدەســـتت ئـــەگرێ
فرمێســـكی[2] بســـڕی بـــەرت تێئـــەگرێ
دڵۆپـــەی ئەشـــكی[3] بـــەرەو بەرئـــەگرێ[4]

٢٠١٩/٣/٢٧ چوارشەممە

**پێشەكی:**

**ئەمەیان جناسە:**

١- بەر ئەگرێ: واتە هەموو دارێكی بەری بەری خۆی هەیە.

٢- فرمێسك: فرمێسكی چاوە.

ئەمەشیان لێكچوونە (الطباق):

٣- ئەشك: فرمێسكی چاو. رەگەزدۆزی (الجناس) وەلێكچوون (الطباق)ی تێدایە.

(ئەشك) بەمانای بەری دارەكە دێ چونكە بەری دارەكە تشبیە كردوە بەئەشكەكە.

٤- بەر ئەگرێ: واتە مقاومەی هەیە و تحمل ئەكا.

# سەیرکە

بــــەد و بـــــەدکار بـــــی خۆشەویســــتی لام
باشـــبی لای خـــەڵکان، ناکـــەی چـــێژ و تـــام
ئیمڕۆکــــــــــە ڕۆژی، دووبەرەکییــــــــــە
گــــەر ئاشـــــتیخوازبی، لای مــــن چ نیــــە
ڕەوشــــتت جـــوانبی، دوژمنــــی بـــۆ مـــن
بەدڕەوشــــت ئەبتـــــە، خۆشەویســــتی مـــن
جـــوانبی لـــەپێش چـــاو خـــەڵکان ئەکـــەوی
تـــا ناشـــیرین بـــی دۆســـت منـــو ئـــەوی
تــــا خۆپەرســـت بـــــی لـــــەلام بـــــەڕێزی
چـــەند مـــاڵ بـــەخش بـــی لێـــی ناکـــەی چـــێژی
هاوســــــەرم نـــــاوێ تــــــەڕ و ناســــــکبی
لام دڵگــــــــر ئـــــــــەبی تیتراوســــــــکبی
(ســــاڕێژ) پێـــت ئـــەڵێ (دژیــــەك) دیـــارە
گشــــت کـــــەس لـــــەبۆیا دۆســــتە وەیـــارە
جـــــاری یەکەمـــــــە (دژیـــــــەك) دابنــــێم
پێـــــی شــــاد و مەســــتم کەبـــــەدوایا دێـــم
ئەمـــــەش لـــــەبۆما جێــــی شـــــانازی یــــە
سوپاســـــــی (خـــــــودا) دڵـــــــم ڕازیـــــــە
بــــەم بـــــەهرە مەســـــتو دڵنـــــەوا و گەشـــــم
چـــــــــێژیدا بەئەنـــــــــدامانی لەشـــــــــم

هەولێر

# قوتابخانەکەم

قوتابخانەکەم ماڵی دووەممە
بێ ئەمەك نیم بۆی، من پێی گەورەمە
دڵم بۆی نەرمە و لەیادی ناکەم
لەلام ڕێزدارە و لەدەستی نادەم
مامۆستاکانیش وەکو کەسووکار
منیان خۆش ئەوێ لێم نابن بێزار
قوتابییەکانیش سەنگینن لەلام
بوونە خوشك و برام لەکۆتا ئەنجام
لەگەڵیان، پێکڕا لای یەکتر جوانین
شیرینین، لەلاییەك، وەك خزمانین
لەهەڵسووکەوتا، لەیەك ڕاهاتین
لەیەکتر دووربین غەمبار و ماتین
دواڕۆژی ژینمان پێی دیار ئەکەوێ
دڵسۆزبە، لەبۆی، هەڵسە لەخەوێ
کەواتە ئەبێ بۆ یەك بسازێین
لەڕاگرتنی، سەنگی یەك ڕابێین

هەولێر
٢٠١٥/٧/٣٠

## نهێن پارێزی

دیــــاره لـــــەلامان، نهـــــێن پـــــارێزت
بەتـــــەنیا (خوایــــــە)، بـــــوه بـــــەهێزت
بەنـــــده لـــــەکاری، دیــــاره بەندەیـــــە
گـــــەر دڵـــــی خۆشـــبێ، دەم بەخەندەیـــــە
بەنـــــده دیــــاره نهـــــێن پـــــارێزت
هـــەر خوایـــە پشـــتت وەدەســـت و هێـــزت
نـــەك چـــیت لەبەرکـــە و ئـــەوەی لەدڵتـــە
خـــۆت پـــێ هەڵکێشـــی و بیکـــەی بەگوڵتـــە
لای (تـــــەنیا) دیــــــاره نهێنیــــــەکانت
لــــەڕۆژی ئێســـــتا و مـــــردن و نـــــەمانت
ئینجـــا لای بەنـــده نهـــێن پـــارێز بـــە
کـــەی ڕێـــزی لێ نـــای لـــەبۆی بـــەڕێز بـــە
نهێنـــی هـــیچ کـــەس مەبێـــژه لای کـــەس
بەســـته دڵنیـــا بـــێ لێتـــا دوو کـــەس
نهـــێن پـــارێزی ســـــەرەکی (خوایـــــە)
هێمـــــای گـــــەورەیی لـــــەژمار نایـــــە
ئـــــەوەی لـــــەژینمان، لـــــەبۆمان مایـــــە
چـــــاکەیە، ئـــــەویتر پووشـــــو کایـــــە
تـــەنیا (خـــودای خـــۆت) بەڕاســـت بزانـــە
سەرچـــــاوەی مـــــان و ژیـــــن و نەمانـــــە

٢٠١٦/٦/١٢

ئوردن– عمان

## (إنَّ النفس لأمارة بالسوء)

## دەروون

دەروون ویســــتی هــــەر وایــــە بــــەزەڕبێ
نایــــــەوێ دووری بــــــەلا وەشـــــــەڕبێ
دەروون ئەیـــــەوێ کـــــە (مُخَیَـــــرْ) بـــــێ
نـــەك بەیاســـای ژیـــن هـــەر (مُصَــــیَرْ) بـــێ
بۆچـــــــوونم وایــــــە دەروون بەدفــــــەڕبێ
بــــەلای مـــــن وایــــە داری بـــێ بـــــەربێ
پــــــەروەردە ئـــــەبێ بــــەپێی ڕێبـــــەربێ
ڕێبـــــــەر قورئانـــــــە وەدووری شــــــەڕبێ
دەروون لای پیـــــاوی ژێـــــر بــــەبێ زەڕبـــــێ
نـــەك لانـــس وەرگـــرێ و دڵـــی هـــەر تـــەڕبێ
دەروون ئەیــــــەوێ خـــــۆ وەکـــــو مـــــەڕبێ
بەکــــەیفی خۆیـــا هـــــەر لەلــــەوەڕ بـــــێ
هـــــەرکاتێ بیـــوێ لـــــەناو پـــــاوان بـــــێ
بەکـــەیف و خـــــواردن بـــێ بەرچـــاوان بـــێ
ســـــەگ لەگـــەڵ مـــــەڕدا هـــــەر کـــــە ئـــــەوەڕێ
گـــوێ لـــەلوورەی گـــورگی دەشـــت و دەر بـــێ
دەروون هـــــــیچ نیـــــــە هـــــــەر لەگێچـــــەڵە
ئـــــــایین زۆر باســــــــی ئـــــــەکا بـــــــەزەڕە
مەچـــــوە ژێـــــر بــــاڵی و دانـــــی پــــێ مـــــەنێ
بـــا لـــــەداخ و کـــــین نـــــابووت و لـــــەڕ بـــــێ

هەولێر

٢٠١٧/٩/١١

## تـــکا

خودایـــــه تــــەنیا، هــــەر ئــــەتۆم لابـــــی
بەسمـــــه بـــا لای مـــن، چـــۆڵ و والاّ بــــی
لــــەم کاتــــه هــــەر ســــەربەرز و خۆشـــحاڵم
ئاســــوودەم بــــەوەی پشــــتم (خــــودا) بـــی

ئێران– بۆکان
٢٠١٦/٨/٨-٧

## گەورەیی خۆت

هـیچ کـات، هـیچ کەسـێ مەکـه گـەورەی خـۆت
گــــەورەی تــــۆ تـــەنیا، (خودایـــه) لـــەبۆت
(خــــوا) تاکــــه، پاکــــه، بەتوانایــــه بــــۆت
بــێ باکــه لەئاســت، گشــت خــەڵکان و خــۆت

ئوردن– عمان
٢٠١٧/٢/١٥

## گەورەیی

کــەس نابــێ بــۆ خــۆی، خــۆی پێگــەوره بــێ
گــــەوره لای خــــەڵکان، ئـــەبێ گــــەوره بـــێ
بــــەڵام بــــەلاما، کــــەس گــــەوره نیــــه
جگـــه لـــەخوای تـــاك، هـــەر لات گـــەوره بـــێ

هەولێر ٢٠١٥/٣/٢٦

## قەرزاری تۆمە

قـــــەرزاری تۆمـــــە خـــــودای بێهاوتـــــا
نـــــازانم بڵـــــێم چـــــی بـــــەبێ کۆتـــــا
خامـــــەم لەئاســـــتی چـــــاکەت ڕوو زەردە
نـــــازانم چـــــۆنت سوپاســـــکەم ئێســـــتا
چـــاکەکار هـــەر تـــۆی لەهـــەموو بـــارێ
زمـــانم کورتـــە و هـــەر نـــاوت ئـــەبا
چـــاومان لەئاســـتت هـــەردەم هەڵنایـــە
پـــەنای لێبـــوردن هـــەر بـــۆ تـــۆ ئـــەبا
دەســـتم لەئاســـتت کـــورت و بـــێ هێـــزە
جوڵـــەی نـــەماوە دەســـت بۆچـــی ببـــا
(خـــوامی)، بەنـــدەکی بێهێـــز و توانـــام
گشـت هـەموو جەسـتەم، کوڕنـوش بـۆت ئـەبا

هەولێر

٢٠١٥/٦/١٥

## فەرمانی خودا

چ نووســـتو یـــاخۆ بـــەئاگا شـــەوان
لـــەڕووی فـــەرمانت، بـــون بـــە پاســـەوان
وەکـــو ڕووت لێنـــاین، لـــەبۆ پەرســـتن
وەهاشـــم وەرگـــرت، ســـوپاس بـــۆ (یـــەزدان)

هەولێر

٢٠١٥/٦/٣

## ئەی بەندە

چـــــاکەکار، (خـــــودا) سوپاســــــگوزارم
لەبـــــــەدکار بـــــــەدووربم زۆر بێـــــــزارم
راز و نهێنـــیم لـــەلات لێـــی بێـــزارم دیـــارە
لەئاســـــت خراپـــــەکار ڕوو گـــــرژ و تــــاڵم

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٣

## سوپاسگوزارم

سوپاســـــگوزارم، (خــــودا) بەهەڵبــــــەت
بەبـــەهرەی هـــۆنراو خامــــەم بـــوە مەســـت
دیـــاری (خـــوا) جوانــە، لـــێم نەچـــێ لەدەســت
بەخشـــراو پێیـــا، گوشـــادە نـــەك بەهەســـت

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٣

## زەیی تەنیا وەند

(خـــوای) تـــاکو، تـــەنیا، داواکـــەم لـــەکێ؟
بـــێ هاوتـــای، گـــەورەی، نیشـــتمانم دەی ڕێ
ڕێی ســـــەرکەوتنو ڕزگـــــاری لای تـــــۆ
دراوە بەبەنـــــــدە، زۆر بـــــەڕێ و جـــــێ
داوام بوردنـــــە، هـــــەر تـــــۆ لێبـــــوردەی
هیوامـــــە، کـــــەوا؟ لانـــــەدەم لـــــەڕێ
ڕێی راســـت و ڕوونـــاك نیشـــان درا لـــەلات
بـــۆ بەنـــدەی هـــەژار، هـــەر تـــۆی ئـــەدی کـــێ؟
ئـــەی (خـــودا) تـــەنیا، کوڕنـــوش، پەرســـتن
بـــۆ (تۆیـــە) هـــەردەم، وە هـــەر لـــەتۆ دێ
خـــودای تـــەنیا وەنـــد، ڕوو زەردم نەکـــەی
بـــوردن، چاوپۆشـــی، زەیـــیم بەخشـــی پـــێ

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٣

## سوپاسی خودا

خودایـــــە هـــــەردەم وەهـــــەر جـــــارەکی
ویســـــتت وایـــــە بـــــۆم، بەیـــــەکجارەکی
سوپاســـــگوزاربم بـــــۆت بـــــەم بەرهەمـــــەی
کـــــەوا مشـــــتێکە لـــــەناو جـــــوارەکی[١]

هەولێر ٢٠١٧/٢/١٠

(١) ئەم تێڕکەیەیە کە جاران هەبوو بەپشتی ولاّغی دادەدا لەسەر کورتانەکەیدا کەلو پەلو زۆری تێئەکرا بۆ گوازتنەوە

## یەکەم جار

یەکـــــەم جـــار کـــەمن زمـــانم جـــولا
پیـــا هـــات، نـــاوی گـــەورەیی (خـــودا)
ئـــەوەی کـــەبۆ مـــن جێـــی شـــانازییە
(خوایـــــە) لانـــــەدەم نـــــەبم بـــــەگومڕا

هەولێر
٢٠١٧/٣/٩

## باوەڕدار

بـاوەڕدار دۆسـتی سـوود بەخشـە نـەك مـار
لـەدوای زانسـتە لـەم شـار و ئـەم شـار
حـەز ئـەکا پـەرە بەزانسـتیدا
ئاوێزانـە بـۆی، خـۆی ئـەدا حەشـار
تـاوەکو کونجـێ لـەدڵی خـەڵکان
زۆر تونـد بنیـات کـا بـۆی بێتـە گفتـار
تـاکو بـڕوا پێـی لـەتاریکیا
لـەبۆ کـەس نـەبا پـەنا وەهـاوار
هـاوار و پـەنا هـەر بـۆ (خودایـە)
قسـەی لابـەلا ئـەتکا بـەزۆرار
زۆرداری خراپـە باجەکـەی ئـەدا
لەلایـەن هێـز و توانـای کردگـار
لـەبۆ بـاوەڕدار زسـتان بـوە بـەهار

نازانـــێ بڵـــێ چـــی هـــەردەم بـــەزار
تـــا لـــــەم وەرزەدا چەشــــە وەرگـــرێ
لـــــەبۆیا ببـــێ بـــــەهاوین هـــــەوار
لەبـــەر وەی شـــەوی زســـتانی درێـــژە
کۆمـــــەکیان ئەکــــەن وەك دەســـــتەبەردار
چـــونکە بـــەلای وان گـــەڵێ زۆر خۆشــــە
دڵنــــەوان خـــەڵکی بـــێ کـــات و هـــەژار
تـــۆ بـــەرگی سســـت و کـــەمکاتی بـــدڕە
تـــا ئیمـــڕۆت خۆشـــتر بـــێ لەســـاڵی پـــار
بـــــاوەڕدار هـــــەروەك شـــــاگردە لـــــەبۆ
فـــــەرموودەکانی ســـــەروەری نـــــازدار
(ســـــاڕێژ) ئامـــــاژە بەکۆشـــــش ئـــــەکا
تـــــا لەکـــــەس نەبیـــــە ڕێگـــــر و زۆردار
تـــــێ گەیشـــــتوان لـــــەڕێی ڕەوانـــــە
خۆشـــنوودەی خـــەڵکن وەکـــو بـــاوەڕدار
خـــۆت بکـــە کەســـی کەســـێکی وەهـــا
بـــۆت پشـــت بـــێ، پـــەنایێ، وەك مـــامو خـــار

هەولێر

٢٠١٦/١١/٢-١

## ڕووناکی دڵم

ئــــــەوەی ڕوونــــــاکی لــــــەدڵما مایـــــــە
هێــــزو، توانـــــاو، گــــەورەیی، (خوایـــــە)
بڕوانـــــــــە دادی، لـــــــــەمردن دیـــــــارە
لێـــی دەربـــاز ئـــەبی؟ کاتـــێ بـــێ ئایـــە؟
هــــــیچ دەســـــــەڵاتێ ڕزگـــــارت ناکـــــا
کـــــەمردنت هــــات، ژیــــن بــــە بەهایـــە
هێمـــــای ڕێـــــز پێـــــدانم بۆمـــــا هــــەردەم
بـــەم دەســــتوورەی وا بـــۆم لا ئـــەبا غـــەم
لـــــەباری دەروون ئـــــەرکم ســـــووك ئـــــەکا
دڵ نـــــەوام ئـــــەکا وەك دۆســــتی ســــەردەم

هەولێر

٢٠١٦/١٠/٢٣

## خوا

خـــوا تاکـــە لەئاســـت ئاسمـــان و گـــەردوون
بـــێ نموونەیــــە، بـــۆ لــــەبیر نەچــــوون
بــــۆ بەندایـــــەتی، بکـــــە شــــــەونخون
بـــۆ خـــودای ئـــارام بـــەخش بـــەدەروون

هەولێر

٢٠١٧/٣/٩

## دەست ڕۆ

(خـــوا) لــــەلێبوردن نموونـــــەی نیـــــە
بەنـــــدە لەئاســــتی (پـــــیرۆزی) چــــیە؟
(خــــودا) تــــۆ گــــەورەی، گــــەورەییت لێ دێ
جگــــە لــــەخودی (خــــۆ) دەســــت ڕۆ نیــــە

هەولێر

٢٠١٧/٣/١

## ستایش

مــــەڵێ ســــتایش بــــۆ زانــــا و شــــایە
ســــتایش هــــەر تــــەنیا بــــۆ (خودایــــە)
ئەمــــەی دان نــــەنێ بــــەم گۆتــــەی گــــوتم
زانــــا و چــــۆن چــــۆنیش بــــێ هــــەر گومڕایــــە
وشــــەی ســــتایش وشــــەکی وایــــە
بەئاســــت و بــــەرزە لەپلــــە و پایــــە
بۆیــــە هــــەر (خــــودا) شــــایانی وەیــــە
ســــتایش بکــــرێ (پشــــتە)، (پەنایــــە)

هەولێر

٢٠١٧/٣/١٨

## زەییو بونی خوا

لــــەزەیی (خــــودا)، بــــێ هیــــوا نــــەبی
لــــەبوونی (خــــودا)، بــــێ بــــڕوا نــــەبی
بەگــــەورەیی (خــــوا)، دڵنــــەوا ببــــی
لــــەباوەڕ بــــە (خــــوا)، پەشــــیمان نــــەبی

هەولێر

٢٠١٧/٥/١٤

# بەرزی و گەورەیی

بـــــەرزی و گــــــەورەیی بـــــۆ (پـــــەروەردگار)
(هێـــــــزدارە) هــــــەردەم بـــــــەکردار و زار
کارســــازی کـــارە لێـــــت نابـــــێ بێــــزار
ڕاســــــتی لێـــــدیارە، بـــــەبێ ڕاوێــــــژکار
نـــەك بـــێ ڕاوێــــژکار هــــەر هـــەموو گـــەردوون
پـــــەنهانی لایتــــی بـــێ دەســــت یــــا زۆردار
کەواتــــــە (خــــــودا) شـــــایانی وەیـــــــە
کوڕنوشـــــی بـــــۆ بــــەی نەبیــــە ســــتەمکار
ســـــتەمکار نـــــەبی، ژیــــان هـــــەر ئـــــەڕوا
لــــە بـــــیری نەکــــەی ویردیــــی و یادگـــــار
یادگــــاری وەی کـــــە، گــــەورەیی (خــــودا)
بـــــــەبێ کۆتایــــــــەوە دەســـــــــەڵاتدار

## سەرێ

ســـــەرێ (خـــــوا) رۆژێ بێنێتـــــە بـــــڕین
بـــــەهیچ کەســـــێکا نایەتـــــە کـــــڕین
خـــوا لەهـــــەموو کـــــەس دەوڵەمەنـــــدترە
کەواتـــــە مەکـــــە شـــــیوەن و گـــــرین
دڵ بەچـــی خۆشـــکەم کاتـــێ أجـــل هـــات
تێکـــت ئەشـــکێنێ و ناتمینـــێ ئـــاوات
ســـەرکەوتن کاتـــێ لای (خـــودا)وە بـــێ
ئەتخاتـــە خۆشـــیو بـــۆت خـــۆش ئـــەکا جـــێ
کـــەخودا ویســـــتی ڕوو زەردیشـــــت کـــا
هیچـــــت پێنـــــاکرێ بەهـــــەوڵ و تکـــــا
هێـــز و توانـــای (خـــوا) بـــێ کۆتاییـــە
(خـــوا) خۆشـــی بـــویم، لـــەبۆم شـــاییە
(خـــــوا) بیکـــــا وابم چـــــۆنی دەربـــــڕم
دڵنـــــەوا ئـــــەبمو زۆر پێیـــــا کـــــرم
بـــێ وێنـــەی هـــەتا هـــەتا هـــەر خـــۆیتی
هـــەر کـــەس (خـــوا) نـــەیوێ ڕۆژێ ڕۆڕۆیتـــی

هەولێر

ساڵی ٢٠١٦ دانراوە.

# نەخۆش

نـــــەخۆش کەکەوتــــە بـــاری ناهــــەموار

لـــــەناخی دڵیـــا هــــەر ئـــەبێ بێـــزار

ئینجـــا هـــاواری لـــــەناخ وەلــــەزار

ئـــــەهێنێ هانـــا بـــــۆ (پــــەروەردگار)!

بـــەڵام خواناســـان بـــەم شـــێوەیە نـــین

خـــوا لــــەبیر ناکـــەن بـــەزار و کـــردار

خوانــــاس لەخۆشـــــیو لەناخۆشــــیا

خـــوای هـــەر لــەیادە لــەدڵ نـــەك بـــەزار

ئـــــەم کەســــە پیـــاوە زیـــانی نیـــە

نـــە لـــــەبۆ بەدەســــت، نەلـــەبۆ هــــەژار

چـەند خۆشـە، خۆشـنوودەی هـەموو کـەس بـی

بــۆ جـــەماوەریش مـــام بـــی وەیـــا خـــار

هەولێر

٢٠١٧/٩/٤

## توانای خوا

کات کەلێت ڕۆیی، ناگەڕێتەوە
لەزێش بەسانا، ناپەڕیتەوە
مەلەی نەزانی کاکی چاوەڕوان
بەپرد کارەکەت سووك ئەبێتەوە
چونکە پرد هەبا، بەسەریا ئەچوی
زۆر بەئاسانیش، ئەگەڕێیتەوە
شتێ نازانی، خۆتی لێمەدە
دوا ئەنجام پەشیمان ئەبیتەوە
گەورەیی بۆ (کارزانی هەموو شت)
ڕۆژێ دێ ڕووبەڕووی ئەبیتەوە
(خوایە) باوەڕمان وەها توند بکەی
توندە (خوا) بیکا توندتر بێتەوە
قەرزاری خوداین، لەهەموو بوارێ
باوەڕمان توندە و، توندتر بێتەوە
تاکو بتوانین هەر گوێڕایەڵی
خوداینە تا ژینمان ئەبڕێتەوە
سەرکەوتوو و ژێرکەوت، فەرمانی ئەوە
گشتی گوێڕایەڵ، (خوا) ئەبێتەوە
بیوێ سەرکەوتی، بیوێ ژێرکەوتی
خوایە تۆش زەییت پێمان بێتەوە

٢٠١٧/٨/١٢

هەولێر

## پەیڕەوی ڕێنمام

**لـــەژێر پـــەیڕەوی ئـــەم ڕۆشـــنا بـــژین**

**بـــۆ (خـــودای گـــەورە) تـــا ئاشـــنا بـــبین**

**لـــەپێناو فـــەرمان (خـــوا) بـــبین بـــەمۆم**

**بتـــوێن و ڕوونـــاک کـــەین پـــێش خۆتـــو خـــۆم**

**ڕەزامەنـــدی (خـــوا) هـــەر بـــەجێ بێـــنین**

**زەخـــیرەی دواڕۆژمـــان دانـــێین لـــەژین**

**چـــیمان لەباســـی ئـــەمو ئـــەو هەیـــە**

**ســـەرکەوتن لـــەیادی (خوداوەیـــە)**

**جموجـــوڵی خـــوێن لەباســـی (خـــودا)**

**لەلەشـــی (ســـاڕێژا) نابـــێ جـــودا**

**هەولێر**

**٢٠١٨/١٢/٥ چوارشەممە**

# ئیمامی علی

نەکـــەی پایـــە و ســـەنگ بـــدەی بەنـــەزان
لـــەخۆت تـــاڵ نەکـــەی گشـــت خۆشـــی ژیـــان
چـــەند نـــەزان بـــەرز و بـــالاَ و بەجێکـــەی
هـــەر ســـووکت ئـــەکا لای هـــەموو خـــەڵکان
ئیمـــامی عـــەلی فـــەرمووی گـــەر نـــەزان
دراوســـێ بـــێ لـــەبۆم لەبەهەشـــتی پـــان
**((ئـــەم کاتـــە بەهەشـــت مـــن بـــەلا ئـــەنێم**
**ئـــاگر هەڵدەبـــژێرم بـــەبێ گومـــان))**[1]
هـــەزاران دروودی خـــوا بـــۆ ئیمـــام
کەهەنـــدە مـــەردە و هەنـــدە قارەمـــان
زۆر شایســـتەیە ئـــەم کەڵـــە پیـــاوە
هـــەموو کـــات بـــوە پشـــتی ســـەروەرمان
قال النبی محمد (ص) (أنا مدینه العلم وعلیٌ بابها)
ســـەروەرمان فـــەرمووی شـــاری زانســـتم
عـــەلی دەرگـــای شـــارەکەمە گیـــان
کەواتـــە خـــودی ئیمـــامی عـــەلی
زینـــدووە لـــەدڵ گشـــتی موســـوڵمان
بـــا ئێمـــەش بڵـــێین یـــادی بـــەخێر بـــێ
تـــا چـــاوی لێ کـــەین لـــەبۆ چـــارەمان
کەڵـــە پیـــاوی وا هـــەر نابێتـــەوە

[1] قال الامام علي (رض الله عنه) (لو كان الجاهل في الجنة جارا لتركت الجنة واخترت نارا)

تـــا ژیـــان مـــاوه و تـــا دوا تەمـــەنمان
لاســـای کـــەرەوه هـــی ئـــەم پیـــاوه
نیـــه وەکـــو وی لەهـــەموو جیهـــان
زانـــا و دانـــا بـــو زمـــانی پـــاراو
مانـــدوو نەناســـوو خـــاوەنی ئـــەمان
خەلیفـــەی چـــوارەم لەڕاشـــدینا
بـــەجێ مـــا لـــەناو جێگـــەی ســـەروەرمان
تـــا زێـــڕ و پـــاره و دراوی ئـــەو زەمـــان
بداتـــەوه دەســـت کەســـی خاوەنیـــان

هەولێر
٢٠١٨/١٢/٨ یەکشەممه

## بەهاری باوەڕدار

زســـتان بـــەهاره لـــەبۆ بـــاوەڕدار
بـــۆ خواپەرســـتی گوڵێکـــه بۆنـــدار
بـــۆ وایـــه چـــونکه شـــەوی درێـــژه
زۆر باشـــه بـــۆ یـــادی (پـــەروەردگار)
ڕۆژیشـــی کورتـــه و ماوەکـــەی کەمـــه
تەرخانـــه لـــەبۆ ڕۆژوی ڕۆژودار
تێشـــووه بـــۆ ڕۆژی کۆتاییمـــان
تـــا جێمـــان خـــۆش بێـــو وەنـــەبین بێـــزار
خـــوا بیکـــا بەهەشـــت جێـــی بـــاوەڕداره

کـــەئاوات خـــوازە و بـــۆی بـــوە دڵـــدار

(ســـاڕێژ) پێـــت ئـــەڵێ نەکـــەی گـــومڕا بـــی

بـــۆ گـــومڕا داد نـــادا گریـــان- هـــاوار

هۆشـــت بخـــە گـــەر جێگـــەی خـــۆ خـــۆش کـــە

ئیمـــڕۆ ژیانـــت خۆشـــتر کـــە لـــەپار

بـــەیادی خـــوا دڵ فەرامۆشـــە

ســـوودی بـــاوەڕدار دێ بـــۆ دڵـــوزار

لـــەکوێبێ هـــەردەم ئـــەم ســـوودەی هەیـــە

لـــەلای هـــەموو کـــەس جوانـــە وەنـــازدار

خۆشەویســـتە لای خـــوداوو بەنـــدە

یەسکیشـــی ســـووکە و وەنابـــێ بـــەبار

لـــەڕۆژی کۆتـــا ئەگاتـــە بەهەشـــت

کـــە پـــڕە لـــەناز، بۆنخۆشـــە بۆنـــدار

ئـــەوەی لـــێ ی هەیـــە چـــاو هـــەر نەیـــدیوە

بـــەپێی قورئـــانو فـــەرمانی نـــازدار

لـــەلای بـــاوەڕدار نـــازدار ســـەروەرە

کەپێغەمبـــەرە بـــۆم بـــوە یادگـــار

هەولێر

٢٠١٨/١٢/٢٧ پێنج شەممە

## دەربڕین

خـــودا تـــۆ گـــەورەی، باڵـــت فرەوانـــە
رازی خـــەڵکانی، نـــاو ئـــەم جیهانـــە
لـــەلاتا دیـــارە، بۆمـــەش پەنهانـــە
بەختەوەریشـــم، هـــەر شانبەشـــانە
خوایـــە بـــێ باکیـــت، شایســـتە و جوانـــە
چـــۆن بـــێ ژیـــانم، تـــۆ وات بەشـــداوم
سوپاســـگوزارم، بـــۆت تـــاکو مـــاوم
کـــارت شـــیرینە، جێگـــەی سەرچـــاوم
جەســـتەم تەمەنـــدار، لەدڵـــدا لاوم
خوایـــە بـــێ باکیـــت، شایســـتە و جوانـــە
هەیـــە لەخۆشـــی، هـــەر مەســـت و گەشـــە
لەناخۆشـــیدا، هـــەردەم بـــێ بەشـــە
لەسوپاســـی خـــوا، دڵئـــەگرێ چەشـــە
وایـــە(١) لـــەئاکام(٢) وایـــە، وەگەشـــە
خوایـــە بـــێ باکیـــت، شایســـتە و جوانـــە
خوایـــە دوا کۆتـــاو، دەربڕینـــی مـــن
لات دیـــارە نـــەك لای، دۆســـت یـــاخۆ دوژمـــن
رۆژانـــی دوایـــی، چـــاڵێکە بـــێبن
باوەڕمـــان پێـــدەی، لێمـــان نـــەبێون
خوایـــە بـــێ باکیـــت، شایســـتە و جوانـــە
هەیـــە لەجـــەنگی، دەروونـــی ئـــەژی
بەهەســـتبی لەخۆشـــی ژیـــن بێبەشـــی

مەرد بە شکستی، نایەوێ بژی
ماندوو نەناسبی، بۆ ژیان ئەژی
خوایە بێ باکیت، شایستە و جوانە
من سەهو بون، دانانێم بۆ کەس
خوایە بێ لەتۆ، کوڕنوش نابەم بەس
ژین بەڕێ ناکەم، بەکەیف و هەوەس
لەژێر چاودێری، (خودا) ئەژیم ئەس
خوایە بێ باکیت، شایستە و جوانە
کەسێ تەمەنی، خۆش بەڕێئەکا
هەبووبێ چاوساغە، وارێ ئەکا
کارزانە و قسەی، زۆر بەجێئەکا
دێوەرەی نەزان، گەڵێ دێئەکا
خوایە بێباکیت، شایستە و جوانە

٢٠١٩/٣/٥-٤

---

(١) واتە بەبەشی خودای گەورە ڕازیە.

(٢) لەخۆشیدایە، واتە لەژیانێکی خۆشدایە.

## شاهی شاهان

لـــــەماوەی ژینـــــی دنیـــــادا، فەلـــەك گـــۆڕانی پـــیٚ دادیٚ
ئـــــەوەی ئـــــەیگۆڕیٚ بـــــاوەڕداربی، بێوچـــــان بـــــەیادت دیٚ
زۆران شـــاهانی وامـــــدیوە کـــــەڕۆژیٚ بـــوون بەدەســـــت و پـــیٚ
شـاهی شـاهانی گشـت گـەردوون، بەتـەنیا (خوایـە) هـەر لـەو دیٚ

هەولێر

٢٠١٩/٥/١٥ چوارشەممە

**پێغەمبـەری سـەروەرمان (د.خ) فەرموویـەتی (لا ضـرر ولا ضـرار)**
**واتە: نەزیانت بۆ خۆت هەبێو نەبۆ خەڵکانی تر.**

## بیٚ زیان بە بۆ خۆتو بەرامبەر

فـــــەرموودەی (ســـــەروەر) لام خۆشەویســـــتە
کەســـــــیٚ ئـــــــەنجامی دا لام بەهەســـــــتە
بـــــاوەڕدار بــــۆ خۆیـــــو وەبــــۆ خـــــەڵکا
زیـــــانی نـــــابێو پێـــــی شـــــاد و مەســـــتە
بــــــەلاّم زیانـــــت بــــۆ خۆتـــــو کەســــــان
کەهـــەت بــو هـــەموو کەســـیٚ لێـــت پەســـتە
کەواتـــــــە بۆچـــــــی لاســـــــار و مـــــــاتی
سوودبەخشـــی خـــۆتو (خـــەڵکان بـــە) هەســـتە
تــــــۆ بــــــاوەڕداری دڵســــــۆز و ڕاســــــتبە
بــــــاوەڕدار بــــــەم فــــــەرموودە، پەیوەســــــتە

هەولێر

٢٠١٩/٦/٢٥ چوارشەممە

## دەستخۆشی

دەستخۆشـــــی لەدەستپێشـــــخەری چـــاکە
تـــۆ چـــاکە بکـــەی لـــەبۆ خـــۆت چـــاکە
پاداشـــتی چـــاکەش جگـــە لـــە (خـــوای) تـــاک
لەکەســـــێ داوا مەکـــــە، (خـــــوا) پاکـــــە

ئێران
٢٠١٦/٨/١

## کار هەیە

کـــــار هەیـــــە کـــــەوا لـــــەبۆم ناگونجـــــێ
ڕێگرێـــــك ئـــــەبێ، دڵ پێـــــی ئـــــەڕەنجێ
بـــــەڵام کارەکـــــەش گـــــەلێ پێویســـــتە
ئـــــەبێ ئەنجامـــــدرێ بـــــا دڵ نەپـــــەنگێ

ئێران
٢٠١٦/٨/١

## قسە

قســـە هـــەر هەنـــدە بـــۆت مـــاڵی خۆتـــە
کەنـــــەدرکاوە و لـــــەزاری خۆتـــــە
چـــۆن مـــاڵ هـــی خۆتـــە، قســـەش هـــەر وایـــە
کەســـــیەتیت زمـــــان، وەدەســـــت و دۆتـــــە

ئوردن– عمان
٢٠١٦/٦/٢٦

## حەسوود

نەمـــدی هـــیچ کەســـێ کـــەمتر لەحەســـوود
لـــەم خـــوەی هـــەیتی وەربگـــرێ لێـــی ســـوود
حـــەز ئـــەکا خـــۆی پۆشـــتەبێ خـــەڵك ڕووت
کـــە هەڵچـــوو ســـەگە بـــۆم ئەبتـــە بـــاڕوت
جیـــای ناکـــەم لـــەدوو دەك هـــەموو کاتـــێ
حـــــەز ئـــــەکا بکـــــا و خـــــەڵك بیباتـــــێ
کـــــەزەڕی لێتـــــدا مانـــــای لێـــــی کـــــردی
هۆشـــیاری خـــۆت بـــە، گـــەلێ بـــەوردی!
بـــــۆ بەرژەوەنـــــدی مافیـــــت ئـــــەداتێ!
ڕازیــــــە حتــــــی یــــــەکی بیباتــــــێ
بەپشـــــتی خـــــودا قێزەونـــــە بەرچـــــاو
لەبـــــەر حەســـــادەت کـــــەوتووە لـــــەباو
کـــــوڕ کـــــوڕی رۆژبـــــێ کـــــەمترین کەســـــە
ئـــەم حـــەوت دێـــر هـــۆنراوە بـــۆ وی بەســـە

هەولێر
٢٠١٩/٩/٢٦ پێنج شەممە

## دەمارگیر

مەڵێ دەمارگیر هیچ واتای نیە
دەمارگیر، کەمی وەبێ ڕێزی یە
پێیا سووک ئەبی لەرادەبەدەر
بێ نرخت ئەکا، ئێستا بەس نیە!

دەمارگیر لەخوی پیاوەتیت ئەخا
بێ سەنگت ئەکا و، ریسواشت ئەکا
خۆشە ڕێزدار بی، هەر لەخۆڕسکا
نەک بڵێن شەرمی، بەجارێ تکا

ئوردن– عمان
٢٠١٦/٦/٢٧

## تیر و توانج

نەبە تیر و توانج پەلپەلکە جەستەم
نەبەدرۆ ببە دۆستێکی هاودەم
کەسێکی کوشتت شینی بۆ مەکە
مەڵێ لەبۆیا خامۆشم بەغەم

ئێران– بۆکان
٢٠١٦/٧/٣١

## جوان

جـــوان بـــۆ جوانـــە؟ لای خـــەڵك جوانـــە
چەشـــەی لێ ئەكـــەن؟ لـــەلایان جوانـــە
بـــەڵاّم لـــە ڕاســـتی، ڕەوشـــت و ڕەفتـــار
لای كەســـانی ڕێـــك، خۆشـــی ژیانـــە

ئێران
٢٠١٦/٨/١٨

## گەرمە تەریقی

هـــەر كارێكـــت كـــرد لـــە ڕادە بـــەدەر
ئـــەڵێن لەرێگـــەی خۆیـــا چـــویە دەر
ڕێـــی راســـتمان زۆرە، بـــۆ لا ڕێ ئـــەگری
گەرمـــــە تـــــەریقی زیانـــــە وەزەڕ
گەرمـــــە تـــــەریقان وەهـــــا ئـــــەزانن
ئـــــەوان بـــــۆ ئـــــایین، زۆر پەرێشـــــانن
بۆیـــە هـــیچ پیشـــەی خۆیـــان نـــاگۆڕن
خۆیـــان پـــێ ڕاســـتە زۆر بـــەزوبانن
شـــاهیدی ڕێـــوی، هـــەر كلكـــە هـــەردەم
بۆیـــە چـــی بـــوێ ئـــەیكا لـــەناو چـــەم
خـــۆی زۆر پـــێ راســـتە و ڕێـــی خـــۆی نـــاگۆڕێ
لـــەكوێوە پســـا گرێیـــدا بێغـــەم

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٩

## پێنووس

چـــی بـــوێ نەخشـــی ســـەر پـــەڕی ئـــەکا
نووکەکـــــەی باســـــی بێشـــــومار ئـــــەکا
پێنــــووس بـــێ بەهایـــە لـــەلای نـــەزان
بـــەڵام گشـــت کەســـان، بـــەو ئەکـــەن تکـــا

ئێران– بۆکان
٢٠١٦/٨/١٧

## منالّ

منـــــالّ لەبێشـــــکە داکـــــڕای ئـــــەژینێ
بـــــەزوبانی حـــــالّ بەچـــــکە ئـــــەدوێنێ
نەســـــاغ بـــــێ هەســـــتی زوو ئـــــەبزوێنێ
دەردی ســـــووك ئـــــەکا و نـــــای شـــــڵەژێنێ

ئێران– بۆکان
٢٠١٦/٨/١٨

## کۆڵی بەسەنگ

کـــــــۆڵی بەســـــــەنگم زۆر هـــــــەڵگرتووە
ئـــــــارامی زۆرم لەبـــــــەر گرتـــــــووە
نەمـــــدیوە کۆڵـــــێ بەســـــەنگتر بیلـــــە
قـــــەرزاری، زمـــــانی کـــــورتکردووە
ئـــەم قســـەی کـــەوا (ســـاپێژیش) گـــوتی
(ئیمـــــامی عـــــەلی) وەهـــــای گوتـــــووە

هەولێر
٢٠١٩/٦/١٠ دووشەممە

## ئەڵێم

ئـــــەڵێم لای کەســــــی گێلـــــو بەدڕەوشـــــت
چـــۆن بــــی لەگـــەڵیا، گشـــتی لێتکـــــەوت
هــــەموو کـــەس مەینـــە، یـــەك ڕێـــز و پایـــە
نــــەزان بـــێ هۆشـــــە، وای دانـــێ خـــــەوت
چـــــاکەی چـــــاکەکار، لات بـــــزر نــــــەبێ
تـــۆپێی بســــووتێ، وەك پــــووش و نــــەوت
کەســــــی ئەمەکـــــدار، لامـــــان بـــــەڕێزە
ڕێــــزی هـــــی خۆتــــە، وەك پاشـــــەکەوت
گشـــــت ئەمەکـــــداران هــــەر پایــــەدار بــــن
نــــەزانی ســـــفرەش پــــێش چـــاوم کــــەوت

ئوردن– عمان
٢٠١٦/٦/٢٥

## سەرسامی

بەچــــی سەرســـــامیو لــــەلای تـــــۆ باشـــــە
لای کەســــــانی تــــــر، گــــــەنمی مزاشـــــــە
ئـــــــەوەی تـــــــۆ پێیــــــا کــــــەئاوێزانی
پێــــی مەســــتی لــــــەلای هـــــیتر تەراشـــــە

ئێران– بۆکان
٢٠١٦/٨/٢

## بەکوێری

بــــەکوێری بــــەرد بـــۆ نێچـــیر مــــەهاوێ
بـــــەدوو چـــــاوی زەق نەکەویــــــە داوێ
رێـــی راســـت دیـــارە، لێـــی گومڕامەبــــە
بێتـــــاوان نەخەیتـــــە بـــــەر شـــــالاوێ

ئێران- بۆکان
٢٠١٦/٨/١٠

## هەر کارێ بیکەی

هـــەر کـــارێ بیکـــەی کـــاتی خـــۆی هەیـــە
ئەگـــەر دانـــابی پـــێم ئـــەڵێی وەیـــە
کـــارت لـــەجێێ ســـەنگی خـــۆی هەیـــە
کەســـێ پـــەیڕەویان کـــا ڕێـــزی هەیـــە

هەولێر
٢٠١٥/٣/٣

## بێزاری

بێـــــــزاری لەچـــــــاوەڕوانی دایـــــــە
زەڕم لێ بـــــدەی خەنجـــــەر لەکایـــــە
بـــەڵام کەســـانی بـــاش لایـــان وایـــە
کـــە چـــابن لـــەبۆت تۆیـــان پـــێ برایـــە

ئوردن- عمان
٢٠١٦/٦/١٢

## چۆنبم

چـــۆنبم لـــەبۆتا مـــن لـــێم ناکـــەوێ
رشـــتم لـــەکارم چـــونکە تـــۆم ئـــەوێ
پـــێم باشـــە کـــەوا، ئـــەتۆش هـــەر بـــاش بـــی
بەراســـتی چـــاکە، پیـــاوی خـــۆی ئـــەوێ

ئوردن- عمان
٢٠١٦/٦/١٢

## چاکە کردن

خراپـــەك ســـەد چـــاکە، ڕەشـــئەکاتەوە
زوبـــانی ناکـــەس، ئەتشـــواتەوە
نەئـــەبوە وابـــا، جـــێ پەنجـــەی چـــاکە
بـــزر بـــا لامـــان، گومـــان داتـــەوە

هەولێر
٢٠١٥/٣/١٨

## لەگەڵ سەگ

ئـــەبینم لەگـــەڵ ســـەگ کەوتینـــە چـــاڵ
کارمـــان پێنـــاڕوا، بۆشـــی بـــوین عـــەوداڵ
لەگشـــت هەڵوێســـتا، بەســـەر و بـــەماڵ
ئامـــادە مەبـــە، ژینـــت ئـــەبێ تـــاڵ

هەولێر
٢٠١٥/٣/١٨

## دڵنەرمی

دڵنـــــــەرمان زۆری هــــــەر تێئەکـــــــەون
چـــــونکە بێئاگـــــان، ئـــــەڵێی لەخـــــەون
دڵڕەقـــــان لـــــەلای مـــــن ناپەســــــندن
مامناوەنــــــدیان، لـــــــەژین پێشـــــــڕەون

هەولێر
٢٠١٥/٣/١٨

## هەر شتێ

هــــەر شـــتێ کڕیـــت ئـــەڵێم دیتتـــەوە
هــــەر ڕێیـــەی بڕیـــت دڵتگـــەش بـــوەوە
ئـــەوەی کەفرۆشـــتت ئـــەڵێم لێتکـــەوت
دۆڕانـــــدت وەبـــــێ ســــــوودە وەخــــــەوت
کەواتـــە هـــۆش و بـــیرت بخـــە کـــار
لـــەکاری بـــەجێ و ڕاســـت نـــەبی بێـــزار

ئێران– بۆکان
٢٠١٦/٧/٣١

## ئارام

کەســـــێ ئـــارامی نییـــە، خـــوا پێیـــدا
تـــۆ ئـــارام، لـــە (خـــوا) داواکـــە پێـــت دا
گـــــەر گرفتـــاری کەســـــی بـــێ ئـــارام
ببـــــی، خـــــوا رۆژێ، ئـــــارامی پێـــــدا

ئێران– بۆکان
٢٠١٦/٧/٣

## چاوەنواڕی (٢)

چـــــاوەڕێ دەردی کوشـــــندە و گرانـــــە
پـــــەیڕەوی قورســـــەو بـــــەزار ئاســـــانە
ئـــارام لەســـــەریا هیـــــوای ســـــەرکەوتن
بەدەســـــت ئـــــەهێنێ لـــــە ئـــــەم ژیانـــــە

هەولێر
٢٠١٧/١٠/٢٨

## پاداشتی چاکە

ئـــــەوەی پاداشـــــتی ڕێکـــــی و جـــــوانی
کـــــاری پەســـــند و بـــــەجێنازانی
کەســـێ کـــاری بـــاش، بـــەخراپ ئـــەزانی
ڕۆژێ تـــــووش ئـــــەبێ، بەپەشـــــیمانی
کەســـــێ کەراســـــتی لا چـــــەوتو بـــــەدە
یـــاخوا ڕۆژێ بـــێ، کـــورت بـــێ زوبـــانی
ئـــــەوەی کەرشـــــتە، لەخۆپەرســـــتی
(خـــوا) نـــەدا دەســـتی، مـــاوەی ژیـــانی
ئـــەوەی کەســـانی باشـــی پـــێ خراپـــە
بەکەســـــانی بـــــاش، ئـــــەڵێ کـــــوانی
کەســـــێکی تـــــیر و تـــــوانج ئـــــەهاوێ
ڕۆژێ دێ کـــــــــەوا بکەوتـــــــــە داوێ

ئـــــەوەی چـــــاوەڕێی بــــەدکاری ئـــــەکا
یـــــاخوا دەرفــــــەتی نــــــەبێ، وچـــــانی
ئـــــەوەی بــــــەدکار و ئـــــاڵۆز و کەمـــــە
بێتـــــە ڕێـــــی مــــاوەی ژینـــــو نـــــەمانی
بـــاش بـــی بـــۆ خۆتـــە، خراپبـــی هـــەروەها
بەنـــــدەناس خوایـــــە، هـــــەر ئـــــەو ئـــــەزانی
کـــــــەزانیت کەســـــــێ، زۆر ناپەســــــــندە
خـــــۆت بپـــــارێزە لـــــــەتیر و تـــــــانی
ئەمانـــــــە گشـــــتی، لای (خـــــوا) دیـــــارن
دێتـــــــەوە ڕێیـــــان، بـــــێ چـــــاوەڕوانی
هەرچــــــی بچــــێنی، ئـــــەی دوریـــــــەوە
لای (خـــــوا) دیـــــارە و، ئـــــەتۆش ئـــــەزانی
دەلا ڕێی مـــــــەگرە و، لەســــــەریا مـــــــەڕۆ
لـــــــەکار و پیشـــــــەت وەکـــــو شـــــوانی
هەســـت بـــە لێپرســـراوی خـــۆت هـــەر بکـــە
هەرکـــەس ڕەفتـــاری نـــەك ڕیشـــی پـــانی
لـــــەکۆتا، پیشـــــەت، پاداشـــــتی دیـــــارە
لـــەلای (خـــودای) تـــاك، تـــۆش پـــێ بزانـــی

ئێران– بۆکان
٢٠١٦/٨/١٠

## حەسادەت

حەســـــادەت کەســـــوکارت لــــێ ئــــەکا
ســــووکت ئــــەکاتو، بــــێ ریـــزت ئــــەکا
دە تــــۆش ئــــەم خــــوە پیســــە فرێــــدە
ســــەنگت ڕاگــــرە و بــــواری پــــێ مــــەدە

هەولێر
٢٠١٥/٣/٨

## جار جار

جــــار جــــار کــــاری وا ئەکەوتــــە دەســــتت
کــــار ئەکاتــــە ســــەر، دەروونــــت و هەســــتت
کــــار هەیــــە کــــەپێت خۆشــــە پێــــی مەســــتی
بــــاغرت ئــــەکا چــــەندی پەیوەســــتی
چــــی بکــــەم دەروون زۆر کاریگــــەرە
تــــۆش بــــەگوێی مەکــــە ئــــەنجامی شــــەڕە
ئــــەبێ لــــەکارت هەســــتت جڵــــەوبێ
تــــا نــــەڕوا بــــەفیڕۆ ڕۆژ و شــــەوێ

ئێران– بۆکان
٢٠١٦/٨/٢

## جیاوازی خەڵکان

ئەبینم ئەوەی لامبەهادارە
لای کەسێکیتر سووك‌و ساکارە
دەروونی خەڵکان لەیەك بۆ یەکێ
جیاوازی زۆری هەیە و نادیارە

٢٠١٥/٣/٢١

## دڵناسکی

دڵت ناسکبێ زەڕ لەخۆ ئەدەی
بەرنامەی ژینت لەدەستخۆ ئەدەی
کارت لەجێبێ سوودمەندی بۆ خۆت
دە دەست کەوتی خۆت لەقیس خۆ نەدەی

٢٠١٦/١٠/١٨

## گلەیی

گلەیی هەرکەس بۆ بەرامبەری
ئەوەیە کەوا پێی بدا زەڕی
چاو تێ بڕینی هەرکەس بۆ ویتر
دیارە هێمایە کەپێی نەوەڕی

هەولێر
٢٠١٦/٦/١٦

## سوودبەخشان

کەسـێکی کەسـوود لێـی رەچـاو نـەکرێ
پێویسـت ناکـاتن کەسـێ بـۆی بمـرێ
پیـاو هەیـە تـەنیا بەجەسـتە پیـاوە
بـۆ وایـە، چـونکە ڕێـی گـومڕا ئـەگرێ

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٦

## هەیە ناز ئەکا

هەیـە نـاز ئـەکا، بـەس بەتەمـەنی
بۆیـە ئـەمو ئـەو پێـی پـێ ئەکـەنی
تـێ بگـەی، ڕەفتـار پایـە و بەهاتـە
ئـەویتر، گشـتی، ئـەتکا بۆگـەنی

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٦

## ئەم کەسە کەستە

ئـەم کەسـە کەسـتە سـەنگت لای دیـاربی
نـەوەک بـێ هەسـت بـی، پێـی شـەرمەزاربی
کـە ڕێزیـان لێنـای، خۆیـان بـەڕێزن
نـەک دووڕووبـن بـۆت، ژیانـت تـاڵبی

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٦

## گەشە و دامرکان

گـــەنج هـــەتا لاوە، هـــەر لەهـــەر ســـتە
کەکەوتـــە نـــاو ســـاڵ، ڕووی لەشکســـتە
تـــا پێئـــەگاتن، ڕووگـــەش و جوانـــە
کـــەدامرکاوە، هیلاکـــو کفتـــە

هەولێر

٢٠١٥/٣/٣٠

## خۆپەرست

خۆپەرســـت نیمـــە بـــەڵام لەگـــەڵیان
لەچـــاڵم، مـــن چـــۆن ڕزگـــاربم لێیـــان
هـــەموو شـــتێ باشـــیان، هـــەر بـــۆ خـــۆ ئـــەوێ
لێیـــان تێـــك دایـــن، پارســـەنگی ژیـــان

٢٠١٥/٤/٧

## ئاواتەخوازی

گشـــت کـــەس ئەیـــەوێ کـــوڕی پیـــاوتر بـــێ
لـــەخودی خۆیـــا، وەبـــاڵا تـــر بـــێ
تەنانـــەت حـــەزیش ناکـــا براکـــەی
لای خەڵکـــدیار بـــێ، وەبەرچـــاوتر بـــێ

هەولێر

٢٠١٥/٣/٣١

## هەرکەسێ

هەرکەسێ کەخۆی بناسێ و بژی
کاری باشئەکا، تاکو خۆش بژی
پێهەڵنابڕی بێ گەیشتن
بەزوبان هیچ کەس نادا بەکوشتن
لەکن ئەمو ئەو باسی کەس ناکا
شکستی ناکا، وەخۆش نەویستن
هەر شتێ کە (خوا) ویستی پێت بدا
هیچ کاتێ نەکەی، خۆت دانێی جودا
یاخوا حەسادەت، لەرەگ و ریشە
(خوا) هەڵیقەنێ، وەنەبتە پیشە
ئەمەی پیشەیتی، ئەم کارە پیسە
پێش چاوی خەڵکان، نەحسو نگریسە
تەنیا شارەزا، ئەوە ئەزانێ
کەچی لەکۆڵە و سەنگی لەشانی
خۆشی لای خەڵکان پێ چوست و پیاوە
لەکردەوەشی دیارە کەخاوە
تا ژینی ماوە و تا ژینم ماوە
ناچم لەگەڵیا خۆم خەمە داوە
لەدڵتا با خۆت پێ ئاسوودە بێ
بەلکە لای خەڵکان زۆر بێ هودە بێ
ماڵی خۆت لەلات سەنگی دیارە
نەوەك هی خەڵکان چ موڵك و پارە

خولیـــــای خــــەیاڵت ســــەنگدارە لــــەبۆت
پیـــا نــــەگۆڕێی، نــــەی دەی لەکیســــخۆت
ئــــیتر چــــەند باســــی، ڕەســــەنیو ئاشــــتی
بکــــــەم کۆتــــــایی نایــــــە بەڕاســـــتی
ئــــەم ســــەنگەی کــــەوا، لــــەکۆڵت نایــــە
لــــەکۆڵتا ســــەنگی دیــــارە، تــــا مایــــە
ئــەرکی خــۆت بــۆ خــۆت، هــی مــن لــەبۆ مــن
نــــاوی کــــەس نــــاینم، بــــەزوبانی مــــن
دەســــتکاری کــاری، کــەس مەکــە (ســاڕێژ)
لــــەلای جــــەماوەر، دیــــارە ســــەنگو هێــــز
چــــەند کــــەوا بۆیــــا بچــــم بــــەدواوە
ســــەنگ تــــەنیا لەســــەر تــــەرازو مــــاوە
خــــۆت بڵێــــی شــــتم، هــــیچ نــــی بەراســــتی
لــــەرێگا ئــــەڕۆی، تــــۆ بەپێخاوســــی
کــــاری لەئەســــتۆتا نــــەبێ نەیکــــەی
بیربکــــــەرەوە و خـــــۆتی لێنــــــەدەی
کــــاری نــــازانی مەیکــــە بەپیشــــە
مەیکــــە بــــەخولیات، وەیــــا سەرئێشــــە
چ هێــــز، چ ڕەوشــــت، چ هەرشــــت دیــــارە
دەســــتت هــــەتا چــــەند، ئــــەڕوا لــــەمبوارە
کــــاری نــــایزانی و پێــــی زمــــان کــــورتی
مەیکــە پیشــەی خــۆت، مــەی کــە بــەخورتی
خــۆت لــەپێش چــاوان، تــاڵ مەکــە قوربــان
مەچــــۆ هــــەر مــــەڕۆ، لەتاریکســــتان

مەزەندەت تا چەند، ئەڕوا لەکارێ
بەمشێوە داوت، لەداویا ئاڵێ
کەس نابتە دەلاڵ تا پێت هەڵبڵێ
تامی نان دیارە، مەی خۆ بەبێ خێ
(خوای گەورە) هۆشێکی وای پێ داوین
هەر سوپاسی کەین، تا ماین و ماوین
هۆشت لەدایکو باوکت باشترە
پێی بڕۆی هەردەم لەبۆت قەدبڕە
ئەوەی ئەتەوێ کەوا پێتبگا
هەوڵی لەدوا بێ دەردێ لەرەگا
ئەچی بەدوایا وەپێی پەیوەستی
نای دەی لەکیستا و نایدەی لەدەستی
ئەمجارەش هەر چی بڵێم سەرسامم
ئەمەوێ بفڕم، ئەدەی لەباڵم
هۆشو بیری خۆت، بەکاربهێنە
لەخۆت مەشێوێ و، مەکە وڕێنە
چەندی پێت ئەخورێ، هەر هەندەی بخۆ
لەڕێی خوار و خێچ، لەڕێی تەنگ مەڕۆ
هەڵسەنگان لەلای زێڕینگەر دیارە
تەرازووی کێشی هەرگیز هەستیارە
دەبا هەر یەکمان، وەکو ئەو وابین
وەکو وی بڕۆین، هەتاکو ماین
بێ تێگەیشتن، پێ هەڵنەبڕین
دەستمان بەدەستی گشت کەس نەگرین

بــــۆ هـــــەموو کەســــێ، چاوەشـــــی نەکـــــەین
خۆپـــــارێز بــــین و، خـــــۆ لەدەســــــتنەدەین
ملــــــی ڕێ نــــــەگرین، بــــــڕۆین بـــــەڕێوە
بـــا پێمـــــان نــــەڵێن، ئــــەرێ بـــۆ کوێـــوە؟
ئەمـــــــــەش بەعقڵـــــــــە کەپێشــــــــەنگمانبێ
گشــت کــات لەگــەڵمان هــەر شــان بەشــانبێ
بـــــوار نـــــەدا پێمـــــــان، شکســـــتی بێـــــنین
زمانمـــــان بـــــەخراپ، لەکـــــەس ببزێـــــوین

هەولێر
٢٠١٦/٦/١٩

## ڕەفتاری جوان

لـــــەپێش چـــــاوی مـــــن کەیـــــەکێ جوانــــــە
نـــــەك هـــــەر دیمـــــەنی، کاریشـــــی جوانــــــە
خـــــۆم کـــــردە برایـــــو، بـــــرای شانبەشـــــانی
چـــــــــونکە ڕەفتـــــــــاری، دووری زیانـــــــــە

هەولێر
٢٠١٥/١/٢٤

## متمانە

متمانـــــەم پێتـــــدا کـــــە بـــــەدڵم بـــــی
پـــێش چـــاوم جـــوانبی، تـــاکو گـــوڵم بـــی
پاداشـــــتی چـــــاکەش، چـــــاکەکاریە
راســـتبە بـــۆم، بڵـــێ، بـــار بـــەملم بـــی

هەولێر

٢٠١٤/١٢/١١

## راکێش راکێش

ژیـــانی ئیمـــڕۆ، ڕاکـــێش راکێشـــە
بۆیـــە زۆر کەســـێ، ئەکەوتـــە کێشـــە
بـــۆ بەرژەوەنـــدیت، گـــوێ لەکـــەس نـــاگری
بـــیرت بـــا بـــڕوا، لێـــدە ئەندێشـــە!

هەولێر

٢٠١٥/٦/٧

## بڕوانە

چـــاکە ماســـت نیـــە بـــەدەمتاوە بـــی
گـــەر بـــێ ئەمـــەك بـــی ئـــەبێ تـــۆ چـــبی
نامـــــەوێ بەچـــــاوتی دادەمـــــەوە
ئـــــەوەی تێناگـــــا ڕۆژی پـــــێ شـــــەوە
خـــوا هۆشـــیارمات کـــا بـــێ هەســـت دەرنەچـــین
نـــــەبین بەنیســـــك وەزوو هەڵنەچـــــین

هەولێر

٢٠١٥/٣/٢٩

## حەسوود

حەســـــوود کەســـــێکە چـــاوی هەڵنایـــــە
بـــــەم کەســــــەی کـــــەوا لەخۆشــــــیدا
تــــۆش نهێنـــی خـــۆت لـــەبۆی دەرمـــەبڕە
چـــــونکە بەخۆشــــــیت، لەگڵپـــــەی تایـــــە
حـــــەز ئـــــەکا تووشـــــی دەرد و بـــــەڵا بـــــی
لـــــەئازار دابـــــی، تـــــاکو ئـــــەو مایـــــە
خـــوا یـــا ربـــێ حەســـوود، ناگـــا بەمقصـــود
دڵڕەشــــــە، ســــــەگی دێــــــرە بەبایــــــە
پـــــەنا ئـــــەباتن لـــــە بـــــۆ چـــــاوی پیســـــی
تـــــا کارتلێکـــــا، خەنجـــــەر لەکایـــــە

٢٠١٥/٣/٢٦

## ڕوو کراوە

بەهەڵســـــــــووکەوت، ڕوو ئەکرێتـــــــــەوە
پـــــــەردەی شـــــەرمی ڕوو، هەڵئەدرێتــــــەوە
هـــەر هەنـــدە کـــە ڕووی، ئـــەم کەســـە کـــراوە
کەسیەتیەکەشــــــــــی زوو ئەســــــــــڕێتەوە

هەولێر
٢٠١٥/٦/٧

## پیری

پـــیری نـــاو تەمـــەن، ڕێـــزدارە لامـــان
کاتـــێ، تێبگـــا، لەبـــەهای ژیـــان
پـــیر نـــەزان نـــەبێ، ســـەنگی دیـــارە
کـــەمجار کەســـیەتی، دێتـــە دارمـــان

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٣

## بۆ دایە و بابە

بـــۆ ایـــە و بابـــە تـــۆ گوێڕایـــەڵ بـــە
لـــەبۆ پاداشـــتیان، چـــاوەڕێی هـــەل بـــە
لەئاســـتیان خـــودی خـــۆت، لا نـــزم بـــێ
چـــاك بـــەبۆیان و، دووری گێچـــەڵبە

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٣

## زێڕ و مرواری

زێـــڕ دەورەی مـــرواری و یـــاقوت ئـــەگرێ
چـــونکە پێـــی جوانـــە، چـــواردەورەی ئـــەگرێ
لـــەلای مـــن هـــۆنراو زێـــڕە لـــەدەورەی
مـــەرجان و لـــوء لـــوء بـــەویش دائـــەنرێ
هـــۆنراو و شـــوێنی خـــۆی تـــەواو گرتـــووە
جیـــا نیـــە لـــەزێڕ، هـــەر بـــەو دائـــەنرێ
زێـــڕ و مـــرواری، لێکوەشـــانەوە
هەریـــەکیان لاییـــەك، نـــازی پێئـــەدرێ
هەولێر ٢٠١٥/٦/٢١

## شانازی

گوڵبـــــام کەپچـــــڕام، بـــــۆنم ئـــــەڕۆیی
شـــــانازی ئەکـــــەم، پـــــێم بڵـــــێن کـــــۆیی
بشپچـــــڕێم گـــــوڵبم، ڕەنگـــــم ئـــــەمینێ
شـــــێوەم نـــــاگۆڕێ، کـــــەبۆنم ڕۆیـــــی

هەولێر

٢٠١٦/٤/١٢

## گۆپارەکەم

گۆپارەکـــــــەم بـــــــو، بەبەرهەڵســـــــتم
بۆیـــــە کەویســـــتم، هێنامـــــە دەســـــتم
بـــــوو بـــــەیاوەرم، لـــــە ڕێگاوبانـــــا
پـــــێم نـــــەبێ لـــــەلام نامۆیـــــە پەســـــتم
لام جوانـــــە، لـــــەلام، ســـــەنگینە کاتـــــێ
بەدەســـــتماوە بـــــێ، پێـــــی شـــــاد و مەســـــتم

هەولێر

٢٠١٦/١٠/٢٣

# سارێژ

مەبەستی (سارێژ) سارێژە لەبۆ
نەخۆشی دەروون، سەرتاپا وەکو
(سارێژ) سووککەری گشت کەمتەرخەمە
نەزانی لەلای من زۆر ستەمە
(سارێژ) سارێژی نەخۆشی ناخە
(سارێژ) سووککەری دەردە وەئاخە
(سارێژ) بن بڕی نەخۆشی دڵە
زمان پاککەرە، پاکە وەك گوڵە
(سارێژ) سارێژی گرفتی گرانە
هەرگیز بۆ پاراستنی زمانە
واتاکەی (سارێژ) لەلام جوانە
بەبەها و سەنگە بزانە گیانە
نازناوی (سارێژ) دانراوە لەلام
بەواتاکانی جوانی بووم سەرسام

هەولێر
٢٠١٧/١٢/٢٥

# جەرگ و پشت

بەهەڵبەســــتم وت، بـــۆت ئەبمـــــە بـــــرا
وتــــی مـــــن جــــەرگم، نـــــاوم لێنـــــرا
جـــەرگو پشـــــت پێکــــڕا لـــــەلام شــــیرینن
هـــــۆنراویش وتـــــــی، جــــــەرگم نـــــاونرا
ئەمەشــــــیان واتـــــای ئەمــــــە ئەبەخشـــــێ
لــــــەدوای تـــــۆ جــــــەرگ جێگرتـــــە بـــــرا
گشــت کــەس حــەز ئــەکا جــەرگی بــاڵا بــێ
زیــــــاتر لـــــــەخۆیا، نــــــــەوەکو بــــــرا
جێگــــرت وەك خـــۆت، نیـــە هـــیچ کاتـــێ
جـــــەرگی لێ دەرچــــــێ، پێشـــــتر لــــــەبرا
جیـــــــاوازی نێـــــــوان هــــــــەردوولا زۆرە
قســـــــەکەم لــــــــەلات ببـــــــێ، بەچـــــــرا
ئێســـتاکە پـــێش خـــۆت بـــاش پـــێ ببینـــە
تێنەگـــــەی گێلـــــی، ئـــــەی چـــــیت پێـــــبڕا!!

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٠

## نەوەکانمان

(لیا خان) و (eve ئیڤ خان) لەگەڵ (میلا) خان
وە (لاوی) گیـــــانیش بـــــوون نـــــەوەمان
پایـــــەداریان کـــــا، خـــــودای بەخشـــــندە
رووســـوور بـــی پێیـــان هـــەموو دەم بەنـــدە
خـــوا نـــــەوەکانمان بـــــەرز و بـــــالاّ کـــــا
دواڕۆژیـــــان خۆشـــــی و دووری بـــــەلاّ کـــــا
ئەمانـــە گشـــتی دیـــاری (خـــوای) تـــاکن
لـــــەبۆ بـــــاپیرە و داپـــــیرە چـــــاکن
گـــــەورەیی خـــــودا، بـــــەبێ ســـــنوورە
روو زەرد بـــێ ئـــەوەی لـــە (خـــودا) دوورە
ئـــەوەی لـــەو دیـــارە، بـــۆ مـــە پەنهانـــە
لەمـــــەش نادیـــــارە چـــــاکی بزانـــــە
هـــــەموو دەم (ســـــاڕێژ) سوپاســـــگوزارە
یـــادی (خـــوای گـــەورەی) هـــەر لەســـەر زارە

٢٠١٨/١/٢٢

## کات

کات کەپیرۆزە زۆر پێوەی دیارە
ناگۆڕدرێتەوە، بەزێڕ و پارە
لەبەها و سەنگا، (خوا) سوێندی پێ خوارد
زەمان لەئاستی، هەر شەرمەزارە

هەولێر
٢٠١٥/٧/٢

## کەسی توانادار

بەوە توانادار ئەناسرێ گیانە
کاری گرانی، لەلا ئاسانە
بەڵام کەسێکی کە بێتوانا بێ
کاری سادەشی لا قورسو گرانە

هەولێر
٢٠١٥/٧/٢٧

## بەڕێزان

بەڕێزان خەڵکیان لەلا بەڕێزە
ئەمەش نیشانەی، رەسەنیو هێزە
رێزم لێبنێی، بالاّ و بەڕێزی
بەدیشبی، هەر لێت ئەکەن پارێزی

هەولێر
٢٠١٥/٤/٢١

## هەرگردە

هـــــەر گـــــردە کەنـــــدێك پڕئەکاتـــــەوە
کەســــــیەتی لــــــەکار رەنگئەداتـــــەوە
کـــــارت لــــــەجێبێ تـــــۆ بەهرەمەنـــــدی
لــــــەجێی خـــــۆ ڕێـــــزت پێئەداتـــــەوە

**هەولێر**

**٢٠١٥/٥/٢٧**

## بەشەرمی

بەشـــــــەرمی بۆیـــــــە لـــــــەلام بــــــەڕێزی
ڕوو کـــــراوە بـــــی بـــــۆم، لـــــەلام بێهێـــــزی
لەهەڵســـــــــووکەوتا، لەنگـــــــــەر ڕاگـــــــــرە
گـــــەر بەڕێزیشــــــبی، لــــــەلام بــــــەپێزی

**هەولێر**

**٢٠١٥/٤/٢٨**

## سەلامم لێت کرد

هـــــاتم بــــــەرەو ڕووت ســــــەلامم لێتکـــــرد
وەڵام بــــــــدەوە، زوو بەدەســــــــت و بــــــــرد
چـــەند ڕێـــزم لێنێـــی، ڕێـــز لـــەخۆ ئـــەنێی
وانەکـــەی لـــەلام بـــێ ڕێزبـــی... چـــیت کـــرد!

**٢٠١٥/٥/١٨**

## رارا و خۆپەرستی

کەســــێکی دڵـــــی ڕارابــــــێ، لــــــەبۆت
لەبەرامبــــــەرتا، خۆپەرســــــتبی بــــۆت
دڵــــت خۆشـــــنەبێ پێــــی، بـــەلاوەی نـــێ
لـــــەژینیش دابـــــێ، وەك مــــــردوە بـــۆت!

هەولێر
٢٠١٥/٥/١٨

## بێنازی

کەهــــەوڵت کــــەم بـــێ نـــازت نامینـــێ
بێنــاز بــوی، هــیچ کــەس، پێــوەت نامینـــێ
تـــــەباییش هــــەردەم لەکاســــەی پـــــڕ دێ
تـــا ئیمـــڕۆت خۆشــتر بـــێ لەچــاو دوێنـــێ

هەولێر
٢٠١٥/٥/١٩

## برسیەتی

کەســـێ برســـی بـــێ ئـــەڵێن هـــار ئـــەبێ
هـــەر کـــەهاریش بـــو، وەکـــو مـــار ئـــەبێ
کاتــــێ بـــــوە مــــار، وەك زۆردار ئـــــەبێ
خـــەڵکیش لــــەزۆردار هــــەر بێـــزار ئـــەبێ
مەهێڵـــــــە برســــــی بگــــــا بـــــــەم رادە
پــار دۆســت بــو، ئیمــڕۆ بــۆت بــەزار ئــەبێ
برســـــیەتی هــــەردەم ئەنجامـــــە لـــــەبۆ
هـــــاری، کــــەپێیا دەســــــتبەکار ئـــــەبێ
کەســـێکی هـــار بـــێ، ســـەنگی نامینـــێ
لـــەپێش چـــاو خـــەڵکان گـــەڵێ تـــاڵ ئـــەبێ

هەولێر ٢٠١٦/٩/٢٨

## جۆڕك

جـــــۆڕك بەســـــەری کـــــەرەوە ئـــــەکرێ
تـــــاکو ئـــــالیکی نـــــاوەوەی بخـــــورێ
بەکـــــەریش بڵـــــێی هـــــۆش، ڕائەوەســـــتێ
بێـــــزاری مەکـــــە بـــــا جەنـــــە نـــــەگرێ

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٧

## لەگەڵ دەستێکم

لەگـــــەڵ دەســـــتێکم لەگـــــەڵ دەســـــتم بـــــێ
ڕێـــــزت لێئـــــەنێم، هەســـــتت هەســـــتم بـــــێ
شـــــەرمم لێبکـــــەی لام گـــــەورە ئـــــەبی
ئینجـــــا بڕیـــــاردە، ك ەلـــــەم دەورەبـــــی
بـــــەجێم نـــــەهێڵی، بـــــێ نـــــازم نەکـــــەی
لەناخۆشـــــیا دەربـــــازم بکـــــەی

هەولێر
٢٠١٥/١/٣١

## سەپانی تۆمە

چـــــەند ســـــاڵە بـــــویم بەســـــەپانی تـــــۆ
بـــــەلاوەم ئـــــەنێی، ئەمـــــدەی لـــــەدەس خـــــۆ
پیـــــاو نابـــــێ کاتـــــێ، کەدەســـــتی خـــــۆی دیـــــت
بمگۆڕێتـــــەوە، بـــــەنانێکی جـــــۆ

هەولێر
٢٠١٥/٣/٣١

## خۆشەویسترین

خۆشەویســـــترین کـــەس، لـــەلات جەرگـــە
لای نــــەزان، ئەنـــــدازەی ڕێـــــز، بەبەرگـــە
خەوشـــــی دڵفرێـــدە، بـــا دڵــــت خۆشـــبێ
ڕۆژێ دێ ژینـــــــت، ئەســــــیری مەرگـــــە

هەولێر
٢٠١٥/٥/١٩

## قسەکم هەیە

قســــــەکم هەیـــــە، ئـــــەڵێم بـــــەتکا
گوێمـــــەدە کەســــێ، دڵـــت لێـــی شــــکا
ڕەوشـــتی گشـــت کـــەس، وەکـــو یـــەك نیـــە
ئــــــەمو ئـــــەو لـــــێکتر، دورنــــو جیـــا

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٧

## پەیوەندی

پەیوەنـــــــدی بەهاتووچــــــۆوە گەرمـــــــە
کـــــردەوەت باشـــــبێ، دڵیشــــــت نەرمـــــە
ڕەوشــــــتت چــــا بــــێ، ئـــــەڵێم برادەرمــــە
بەدیشـــــبی هـــــەرگیز، هــــەر بــــەتۆم شـــەرمە

هەولێر
٢٠١٥/٥/١٩

## ڕەفتاری شیرین

ڕەفتـــــاری شـــــیرین، لای مـــــن جوانـــــە
زۆر بـــــــەهادارە و، ســـــــەنگی گرانـــــــە
بینینـــــــی روخســـــــار، نایەتـــــە ڕێـــــزی
ڕەفتـــــــارێکی وا، چەشـــــــەی ژیانـــــــە

هەولێر
٢٠١٤/٦/١٧

## یەکبگرن

لێـــك دڕ دۆنـــگ مـــەبن، تـــاکو ســـەنگین بـــن
تـــاکو دلشـــاد بـــن، بـــەهێز و تـــین بـــن
لـــەپیشەکـانـتـــان ورد و گـــورج بـــن
گۆشـــەگیر مـــەبن، نـــەوەك چـــین چـــین بـــن

هەولێر
٢٠١٥/٢/٣

## گونجان

ئەمانـــــەی لەگـــــەڵ یـــــەکا ئـــــەگونجێن
زۆر دوورن لـــــــەوەی لەیـــــەك بـــــڕەنجێن
بـــۆ ســـوودی خۆیـــان، یـــەکتر نافرۆشـــن
پیـــاون وەنـــــەڵێی خـــــۆ کـــــوڕی ڕۆژن

هەولێر
٢٠١٥/١/٢٤

## سەنگی شت

شـــتێ هـــەڵتگرت، لـــەجێی خـــۆی دانـــێ
کەســـــێ وا ئـــەکا، ســـــەنگی بزانـــــێ
هـــەر شـــتێ، لەشـــوێن خۆیـــا لابچـــێ
بـــەس، دەســـت لێـــدەری پێیـــا ئـــەزانێ

هەولێر

٢٠١٥/٦/٨

## ڕووم لێنای

ڕووم لێنـــای کـــە ڕووخۆشـــبی لەگـــەڵم
روو بەخەنــــدەبیو، ڕەچـــاوکەی هـــــەڵم
هــەر کــە ڕووخــۆش بــوی، کــار ســانا ئــەبی
لـــــە ڕوو خۆشـــــیا، ئەبیـــــە بـــــرادەرم

هەولێر

٢٠١٥/٦/١٧

## هەست و کردەوە

هەیـــــە تەمـــــەنی چـــــەندی گـــــەورەبی
لەهۆشـــو بـــیرا، هـــەر بچـــووك ئـــەبی
هەســـت و کـــردەوە، بگونجـــێ پێکـــڕا
بـــەپیاو دەرئەچـــیو، لام گـــەورە ئـــەبی

هەولێر

٢٠١٥/٦/١٦

## لەبەر خاتران

کـــەمن خـــۆم ئەچـــم، لەبـــەر تـــۆ ئەچـــم
کـــەتۆ خـــۆت نەچـــی، ئـــەمن بـــۆ بچـــم
دەســـــــتووری ژیـــــان، لەهەڵســـــووکەوتا
بـــەدیار ئەکـــەوێ، بـــۆ هـــەر کـــوێ بچـــم

هەولێر
٢٠١٥/٨/٤

## برسی (خوا)

کەســـێ خـــوا برســـیو چاوچـــنۆکی کـــا
هـــەر برســـی دیـــارە، کـــێ چـــی بـــۆ بکـــا
هـــەر خـــورێن ئـــەبێو، بەکـــەس تێـــر نابـــێ
تـــــۆش پـــــارێزی کـــــە لێیـــــا بـــــەتکا

هەولێر
٢٠١٦/٧/٥

## مەبەستی جیا

هەرکەســــــبەیاری خۆیــــــا هەڵئــــــەڵێ
پێـــــی گرفتـــــارە، پێـــــی ئـــــەڵێ بـــــەڵێ
ویســـــــتت وەهایــــــە، پــــــەتی گرفتــــــت
بپســـــێنی و ڕاکـــــەی، دووربـــــی لەشـــــەڕێ

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٤

# هەڵمەخەڵەتێ

هەڵمەخەڵەتێ بەدەم ئەمو ئەو
با ڕۆژی ژینت، لێ نەبێ بەشەو
پێش خۆت ببینە با نەکەویە چاڵ
تا شیرنی ژینت، لێ نەبێ بەتاڵ
هەڵمەخەڵەتێ بەزوبانی لووس
زوبان کە لووس بو، تیژترە لەمووس
کەهەنگاو داوێی پێشخۆت ببینە
کەسانی ئیمڕۆ، گشتی چین چینە
بەقسەی ڕەوا دۆست ئەتگرێنێ
هەستی ناو دڵت، زوو ئەبزوێنێ
با دۆستی یەك بین لای یەك شیرین بین
بۆ خۆشی یەکتر، گەرمە برین بین
با هەڵەی بچووك لێك گەورە نەکەین
روو خۆش بین، چاوپۆشی لێکتر بکەین
نازانم چۆن چۆن، پێت رابگەینم
رێنمایی خۆم، تا لەسەر زەینم
ئەمانە گشتی دیاری (خودانە)
بەئێمەی داون، تۆش پێ بزانە
پەرۆش بی بۆیان، گوێڕایەڵ (خوا) بە
نەکەی بدۆڕێی گورجو وریابە
راست بە، ڕێگەی ڕاست، ئەنجامی جوانە
وریای کارت بی، دووری لەتانە

کارزان بە، ورد بە، تا سەربکەوی
ڕاست بە، بەرهەمت، لەدەست نەکەوی
گەر لەگەڵم بی لەگەڵتم هەردەم
بۆم ببە هاوڕێ، ئیمڕۆ و وەهەردەم
بەکەسی سادە، هەڵمەخەڵەتێ
تا گومڕا نەبیو، لا نەدەی لەڕێ
کەسانی نەزان هەڵخەڵەتاون
کڵاوی با بردوویان لەسەر ناون
چۆن تێت بگەینم کارت لەجی بی
خزم بە تۆچی، با لەهەر کوێ بی
ڕاست بە، کارساز بە، ڕێگەی خوار مەگرە
هەڵمەخەڵەتێ، لەبۆ کەس مەمرە
دڕکی ماڵی خۆت، مەگۆڕە بەگوڵ
بیکە بولبولو، دای نێ لەسەر دڵ
(خوا) پشت بێ، پەنابێ، تێناکەوی
لەکارەکانت هەر دواناکەوی
ڕێی گومڕا مەگرە، لەهیچ هەڵوێستێ
تا سەرکەوتنت بکەوتە دەستێ
چەشەی سەرکەوتن، دەروون ئەیبینێ
تا خۆشیت زیاتر بێ، لەدوێنێ
ناتوانم من چۆن کۆتایی بینم
بەم بیرۆکەیە، گەرمە بڕینم
بیرۆکەی خامەم، ئەسپی گۆڕەپان
کفت و شل نابێ، لێیان بێ وچان

تــۆ راســتبی، لای (خــوا) و بەنــدە دیــاری
شکســـــت نـــــاهێنی، بەشـــــەرمەزاری
دەســـتی رەواگـــرە، دەســـتت شـــل نابـــێ
(تـــەنیا وەنـــد) دەســـتت بـــەرنادا وابـــێ
زانـــا لەهەڵوێســـت، ســـەرکەوتن دێنـــێ
تـــۆی خۆشەویســـتی هـــەردەم ئـــەڕوێنێ
دوا کۆتـــایی تـــیری وردم دەرمانـــــە
پـــەیڕەویان بکـــە، تـــۆ لـــەم ژیانـــە
تـــا ئاســـوودە بیـــو، دڵنـــەوا و، ڕووخـــۆش
رووســـوور و گەشـــبی، پـــێی بـــی فـــەرامۆش
کـــێ خۆشەویســـتی، بچـــێنی لـــەدڵ
شـــاد و دڵخۆشـــو گـــەش ئـــەبێ وەك گـــوڵ

هەولێر
٢٠١٥/٥/٢١

## خۆڕاگری

(خــوا) یــار بــێ، ئــەڵێم، تــۆ خــۆڕاگر بــی
هـــیچ شـــتێ نایـــێ، لـــەبۆت ڕێگـــر بـــی
هـــەوێنی گشـــت کـــار، هـــەرگیز ئارامـــە
بـــاگرێی دڵـــت، تونـــد نـــەبێو چـــڕبی

هەولێر
٢٥-٢٠١٦/١٠/٢٦

## من هاتمه لای تۆ

من هاتمه لای تۆ بەئومێدی وەی
کەئاسوودەبم هەر بڵێم ئۆخەی
چەندی رووخۆش بیو پێم دەی وچانت
بۆم دیار ئەکەوێ دەستکەوتەکانت
مەبەست لەدەستکەوت سەنگو پایەتە
هەر بەم شێوە بە تاکو نەمانت
راست بی خۆشنوودەی کەسانی راستی
کارەکەت دیارە لەبازۆ و شانت
بەهەوڵت دڵی خۆشت شاد بکە
کردەوەت جوان کە ماوەی ژیانت
هەڵمەخەڵەتێ بەزاری خەڵکان
با رەنگ داتەوە لەکارەکانت
ئەمەش بەهرەیێ (خوا) پێمان بدا
خۆشەویست بی لام، وەك رۆڵەکانت
یاخوا کەسانی راست لەخۆشی بن
تاك تاك پیرۆز بێ هەر لەزوبانت
تیر بەدڵکەوێ جێگەی دیارە
نیشانی ئەدا، شکستەکانت
راستبە، لەرێی شێر، راستی نیشاندە
ئەنجامی دیارە، دەستکەوتەکانت
بەرگری بکە لەراستی و رەوا
بەکاربهێنە، تیر و کەوانت

سەربەرزی خۆشە لەناو کۆمەڵدا
نەك هەر بەقسە، بەتێکۆشانت
سوپاس بۆ (خودا) پشت بێو، پەنا بێ
ئەی بەدکار دوور بم لەتیر و تانت
شتێ پێت راستە، لێی ڕاڕا مەبە
سوودمەندم (ساڕێژ) بەقسەکانت

هەولێر
٢٠١٥/٥/١٥

## بەراستی

بەراستی دونیا، مەرگو مردنە
بۆ هەموو کەسێ، وەك راکردنە
بڕوام پێ بکە، دواڕۆژ نادیارە
شێرە ئەم کەسەی، خراپەی لا ونە
ئەنجامی دواڕۆژمان لای (خوا) تەنیا
- دیار و ئاشکرایە، بەدکاران چنە
ژینەك کۆتایی کە بەمردن بێ
چاکەکار، خۆشنوودەی خەڵك و منە

هەولێر
٢٠١٦/١٠/٢٣

## بێ دەسەڵاتی

بـــێ دەســـــەڵاتان، گشـــت ئـــەڵێن دەبـــا
دەســـتمان تونـــد بگـــرین کڵاومـــان بـــا نـــەیبا
ئەمـــــەش نیشـــــانەی ناچـــــاریە لـــــەبۆ
ئەمـــــەی وا ئـــــەکا و وەپـــــەنا ئـــــەبا

هەولێر
٢٧-٢٠١٦/١٠/٢٨

## سەگی بە ئەمەك

بینـــــیم ســــــەگێکی پــــیری ئەمەکــــــدار
خـــاوەنی تـــەواو، لێـــی ببـــوو بێـــزار
مـــــەڕ و مـــــاڵاتی نـــــەمابو کـــــەوا
چـــــاوەدێری کـــــا، وەپاســـــیان بکـــــا
بـــیری کـــردەوە پێـــی بـــەخێو نـــاکرێ
هیلاکـــی نـــەبێ، هیچـــی پـــێ نـــابڕێ
وتـــــی واباشـــــە، بیبـــــەم بـــــۆ دەرێ
خـــۆم لێ ی بزرکـــەم، بـــا هـــەر بـــوەڕێ
لەدەشـــت و لـــەدەر، سەرشـــێواو ئـــەبێ
لەبـــەر پیریـــا، لەشـــی خـــاو ئـــەبێ
رزگـــارم ئـــەبێ، بـــۆ خـــۆم دێمـــەوە
لەپاشـــــــەویدا، ئەحەســـــــــێمەوە
وانەکـــــــەم.. لــــــەکۆڵما نابێتـــــــەوە
لـــــەماڵما، جێگـــــەی هـــــەر نابێتـــــەوە

لەلای بێئەمەك، پیر یەسکی گرانە
تەمەنی پێش چاو، لەدابڕانە
لەجیاتی ئەوەی، کەڕێزی لێ نێ
بەجێی نەهێڵی، لەشار و لەدێ
سەگەی پێ سووکە و، لێی بێزار ئەبێ
پێی رارا ئەبێو، بۆی وەك مار ئەبێ
سەگەی بردە دەر، وەرز زستان بو
شەماڵ هەڵی کرد، بەفر و باران بو
سەگەی پێش خۆیدا، بەدڵێکی تەنگ
خۆشی ناو دڵی، لێ ببو بەجەنگ
لەڕێگا تووشی گورگێکی دڕ بوون
ترسیشی هەبو، خۆی لەبزر بوون
چونکە ئەم کاتی تاریکە شەو بو
شەویش درەنگ بو، وەکاتی خەو بو
بینی سەگەی پیر واپاسی ئەکا
لەگورگی برسی، رزگاری ئەکا
کەخاوەن سەگە، ئەم دیمەنەی دی
بڕیاری کۆتای دا، کەوا نەکا
کۆتا بڕیاری گوتی تا ماوم
یارمەتی سەگە، ئەدەم بەچاوم
هەڵسا خۆی سەگەی پێش خۆی دا بۆ ماڵ
تا دووری بکا، لەهەڵوێستی تاڵ
لەشەرمەزاریا، ئارەقەی سڕی
لەداخو حەسرەت وەخت بو بگری
دانی نا کەوا، لەگەڵ ئەمەکدار
هەر چاکە بکا، لەدێهات و شار

ئەیویسـت سـەگەی پـیر لەکۆڵکاتـەوە
سـەگەش گورگـەی لێـدوور ئەخاتـەوە
ئـیتر ئـەبێ کـار، لـەجێی خـۆی بکـرێ
بـژی ئـەم کەسـەی، بـۆ چـاکە ئـەمرێ
سـەگ بەئەمـەکتر بـو لـەخاوەنی!
بۆیـە خـاوەنی وا پێـی بـو خـەنی
چـاکەی چـاکەکار، مەخـەرە پشـتگوێ
ڕاسـتی سـەنگدارە، لامـەدە لـەرێ

هەولێر

٢٠١٦/١١/١٧

## ئاوێنەم لەبۆت

بێیـە پـێش چـاوم، ئاوێنـەم لـەبۆت
خـۆت چـۆن ببینـی، منـیش وامـە بـۆت
بـەڕەفتار لـەبۆم، ببـە خۆشەویسـت
بـا دیـار بـی لـەلام، هـەر بەهـەوڵی خـۆت

هەولێر

٢٠١٦/٣/٣١

## شوان

ئـەم کەسـەی کـەوا تـۆ پێـت شـوانە
لای کەسـانی تـر، بـەها هەرزانـە
شـوان سەرپەرشـتی مـاڵاتی ئـەکا
خـوارتر بـێ پایـەی لەدارمانـە

هەولێر

٢٠١٥/٦/٢١

# کەسێ نەتەوێ

کەســـێ نەتـــەوێ خســـتتە بـــەر تۆڵـــە
کـــەکینت هەڵســـا، پێـــی ئـــەڵێی زۆڵـــە
زۆڵ دیـــــارە، دایکـــــی کەناتـــــەواوە
پـــێی شـــەرمە، نـــاوی ســـووکی لەکۆڵـــە
بـــەڵام وەك پیـــاو، تـــۆ خـــۆڕاگر بـــە
هـــیچ کاتـــێ نەکـــەی، لێـــدەی ئـــەم دۆڵـــە
شـــتێ نـــازانی، نـــاوی مەخـــە دوو
بشـــزانی مـــەیلێ، پێـــت ئـــەڵێم ڕۆڵـــە
زێـــدە گوناهـــان، لـــەخۆ بـــار نەکـــەی
دوورکـــەوە هـــەردەم، لـــەم شـــەڕ و شـــۆڵە
چـــونکە چـــەند بـــژی تـــاڵاوی مـــەرگ
ئەنۆشـــیو، لاشـــەت ئەســـیری خۆڵـــە
وابکـــە لای (خـــوا)، کەخۆشەویســـت بـــی
نـــەك بـــەکاری بـــەد، ڕۆژێ شکســـت بـــی
زمـــان پاراســـتن پیشـــەی زانایـــە
ڕەزامەنـــدی (خـــواش) لـــەبۆت هانایـــە

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٧

# کلیل و قفڵ

کلیل لەبەندی ڕزگارت ئەکا
لەناو چوار دیوار ئازادت ئەکا
قفلیش هەمان سووڕ بۆ خۆی ئەبینێ
کاتێ داخرا بێزارت ئەکا
کەواتە قفل و کلیل برانە
وەکو جەستەکن وابوون و وانە
بیانوێ کاتێ هەرگیز بێ گومان
سەر ئەشێوێنن لێت بێوچان
قفل قایم بێ، کلیل پەیاکە
تەمەڵی مەکە و ئازابە ڕاکە
کلیل بزر بێ، قفل ئەیەوێ
بیدۆزییەوە، نەك لێت بکەوێ
کلیل و قفل بەهەمان سووڕا
بۆ خۆیان ئەڕۆن نزیکو دورا
ئەمانەی گوتم وەکو دەست نیشان
بیانپارێزە بەدڵ و پەیمان
هەموو ئامێرێك لەشوێنی خۆیا
هەریەك بۆ وی تر سوودبەخشە بۆیا
دە هەڵیان بگرە بۆ کاتی پێویست
بەکاریان بێنە بەوردی و بەرشت
بۆ هەموو گرفت ڕێگە دانراوە
بۆ خۆراگرێك کەلێی وەشاوە

تـــا کـــاری ســـەختی لـــەلا ســـانا بـــێ
کۆســـــپەی ژیـــانی لا چـــاره کرابـــــێ
ئەمـــەش یارمـــەتی (خـــودای) پێویســـــتە
کەســـــێ بزانـــــێ مەنـــــد و بەهەســــــتە
چــــونکە کـــاری (خـــوا) ورد و تـــــەواوە
هــــەموو شـــتی پێویســــت مـــافی پێــــداوە
بێکۆتــــــا کــــــاری، لەجێیـــــە و جوانـــــە
هەمووشــــیان ســــەنگیان بــــەپێز و گرانــــە

هەولێر
٢٠١٥/٦/٥

## چاوبرسی

گــــەنم لـــە بــــۆ مــــن، جــــۆ بــــۆ کەرەکـــەم
میـــوەی بـــاغ بـــۆ مـــن، گیــــا بـــۆ مەڕەکـــەم
بــەس خــۆی تێــر ببــێ، گــوێی لەکــەس نیــە
بــــا لەحەســــــرەتا تــــۆش بگــــری وەرەم

هەولێر
٢٠١٦/١١/١١

## کەچاکەکار نی

کەچـــاکەکار نـــی، یەســـکت گـــران مەکـــە
کـــەس لـــەکاری بـــاش، پەشـــیمان مەکـــە
مـــاڵی کـــەس پـــێش چـــاو زیانـــدار مەکـــە
خۆشـــت تـــووش هـــاتی، تـــیرو تـــان مەکـــە

هەولێر
٢٠١٦/١١/٢٣-٢٢

## شەهید

کەســـێکی چـــۆن چـــۆن بکـــوژرێ دیـــارە
کـــوژەر ســـتەمکار بـــێ، شـــەرمەزارە
بەگشـــت کـــوژراوان ئـــەڵێن شـــەهیدن
زامەکـــەی کـــەم بـــێ یـــا پـــارە پـــارە
هەڵـــە و نادیـــارە بڵـــێین شـــەهیدە
پـــێ زانینـــی مـــەش (پـــەروەردگارە)
هـــەموو شـــتی پـــەنهان بـــەس (خـــوا) ئـــەزانێ
(خـــوا) بەگشـــتیا پـــێ ئاگـــادارە
کەواتـــە (خـــودای) خـــۆت چـــاک بناســـە
گشـــت کـــەس لەچـــاکەی (ئـــەو) شـــەرمەزارە
قـــەرزی (خـــوا) بەکـــەس هـــەر نادرێتـــەوە
(گـــەورەیی) بـــێ کۆتایـــە لـــەم بـــوارە

هەولێر
٢٠١٧/١/٢٦

## دیارە بەڕێزی

ڕێـــزت لـــەمن نـــا، ڕێـــز لـــەخۆ ئـــەنێی
منـــیش ناپرســـم کـــەوا ئـــەتۆ کێـــی
مـــن ســـەنگین بم لات، خـــۆتیش ســـەنگینی
کـــار جـــوانبی هـــەردەم، دڵتخۆشـــە پێـــی

هەولێر
٢٠١٦/١١/١٥

## بەهاناوەچوون

هـــیچ خێـــرت بـــەنێو چـــەوانا نیـــە
کەســـێ تێـــت نـــەگا لام دانـــا نیـــە
زانســـتی ژیـــان، بـــێ پەرەپێـــدان
هـــیچ کـــات شـــیاوی ڕێزلێنـــان نیـــە

هەولێر
٢٠١٥/٥/١٩

## بەرژەوەندی

ژیانمـــــان گشـــــتی بەرژەوەندییـــــە
خـــزم و کەســـی درۆش ئـــەنجامی نیـــە
ئـــەم بێـــژەی بێـــژتم، ئێســـتا بـــەئێوە
وام لێهـــات، بەگشـــتیان بڵـــێم چـــیە!

هەولێر
٢٠١٥/٥/٢٨

## ویستم بنوم

درێژ بوم تا بنوم، خەو نازم راگرێ
ویستی خەو وابو، کەپێ دابگرێ[١]
لەنێوان خەو و دەروونم هەستێ
هەیە، ئەیەوێ بژی وەنەمرێ[٢]

لێکدانەوە:

(١) بنوێ

(٢) ئەیەوێ بژی

بژی: مانای هەر بەخەبەر بێ وەنەمرێ، واتە خەوی بەمردن داناوە. (کتشبیه)

## ناز راگرتن

هیچ کەسێ فێری ناز و نوز مەکە
کەفێر بو ئەبێ هەر پشت گوێی نەخەی
هەیە شایانی هیچ شتێ نیە
تۆ لەکوێ! ئەو چی لەباران نیە!
نازی هەموو کەس پێت ڕاناگیرێ
کاری وا مەکە بەبێ تەگبیرێ
ناز مەدە کەسێ فەرامۆشی کەی
هەربۆیە ئەڵێم، کاری وانەکەی
کەسێ شایانی، ناز پێدان نەبێ
نازی هەڵمەگرە و، نازی پێنەدەی
چونکە کەس بەدۆی خۆی ناڵێ ترشە
ئەبێ تۆش سەنگ بەهەموو کەس نەدەی

هەولێر

٢٠١٧/١/٢٩

# لایەنەکانی ژین

بیستوومە تاوس دەنگی ناخۆشە
بەڵام جوانیەکەی، لەبۆی چاوپۆشە
لەهەر باریٚکا، کەکورتت هێنا
ئەگەر باشتر بوی، تۆی جگەرگۆشە
لەگشت کار، لانی چاکی و خراپ هەیە
چاکە هەر بزرە، خراپە ڕووپۆشە
خراپە تۆ بسڕەو، چاکە ئەنجامدە
تا لام گەورەبی و، دڵم پێ خۆشە
گشت شتێکی باش بوە پێچەوانەی
پەستی، لاساری پێم فەرامۆشە
لەهەر کەس لانی شیرینی هەبو
لەدڵ جوان ئەبیو، پێی دێیە جۆشە
تۆ نابێ، هەردەم بەهەڵوێستی بەد
بخوڕی نا..... دەبا بڵێن رووخۆشە
لانی، ناشیرنی و، بەدی و، چرووکی
کەپێی گەشبین بوی، ئەڵێم سەرخۆشە
جوانی و گوشادی و دڵتەڕی و مەستی
دەروونت لەخۆشیانیان بێ هۆشە
ڕەوا پەروەر بە، مافی کەس مەخۆ
ئاسوودەم بڵێن، پیاوە لەم گۆشە
لەهیچ کار هێڵی سوور مەبەزێنە
کەوات کرد، کارت، چروکو بۆشە
مافی خۆت بۆ خۆت، هی کەسان بۆ وان
وابی پێت ئەڵێن، ئەو ڕەوانۆشە

## دیاری

لەهـــەر باغـــێ لـــەبۆ دڵمـــا، گوڵێهـــات بـــو بـــەمیوانم
لەهـــەر گەشـــتی خـــەیاڵی مـــن، ئەجۆشـــا و دای لـــەزوبانم
منـیش هـەر شـادمان و بەختـەوەر بـوم پێـی لەگشـت کاتـێ
تـــەزی هـــۆنراو بـــو تۆمـــار بـــو، لـــەلاما چـــەندی بتـــوانم
لـــەباغی پـــڕ گوڵـــو خونچـــە، وەکـــو بـــەهرەك کـــە رازاوبـــێ
وەکـو دیـاری بـو بـۆت (سـاڕێژ) بڵـێ هـەرکاتێ ئـەیزانم
کەواتـە مـن ئـەڵێم (خوایـە)، ئەمـەش وەك بەهرەیـە بـۆ مـن
سـوپاس بـۆ تۆیـە سـووکت کـرد هـەموو ژانـێ لـەناو زامـم

هەولێر
٢٠١٧/٢/٦

# هەرکەس

هەرکـــەس گـــوێز لەبـــەڕکی خـــۆی ئـــەژمێرێ
لاســــــا کەریشـــــــی زوو هەڵئـــــــەدێرێ
ڕیچـــکەی جـــوان و راســـت جێـــی لەســـەر ســـەرە
پـــــەیڕەو نەکــــــەری، لـــــەلام وەك کــــەرە
تـــــۆش وەرە بـــــۆ لام لێکــــــی بـــــدەوە
کارســـــاز بــــە تـــــاکو نــــەڵێم لەخــــەوە
چـــیت لەبەڕکایـــــە، هەنـــــدە شـــــت بکــــڕە
لـــــەپێناو ســـــەری بـــــەرزتا بمـــــرە
نـــانی وا بخـــۆ کـــە ڕەنجـــی خـــۆ بـــێ
کـــارت لەســـەر یـــەك بـــێ وە لـــەجێ بـــێ
پێـــت ئـــەڵێم دیـــارە نـــەزان و نـــەفام
بەدپەروەردەیـــــە و نیـــــەتی ئـــــارام
بۆیـــــە ئـــــەبینم، فـــــاولی وا ئـــــەکا
نایەتـــــە ســـــەر رێ، بـــــۆ وایـــــە تکـــــا
کـــارت لـــەجێ بـــێ، تـــا تەماشـــات کـــەن
لـــــەناو کۆمەڵیشـــــا ڕێـــــزت پێـــــدەن
بـــا هـــەر نـــاوت بـــەن، چـــەند ژیـــر و مەنـــدە
چـــــەندە دڵگـــــرەو، چـــــەند روو بەخەنـــــدە
لەچـــەنگی خۆتـــە، یەســـکی خـــۆ ســـووك کـــەی
نـــەك لـــەپێش چـــاوان، خۆشـــت بچـــووك کـــەی
کـــــردەوە و ڕەفتـــــار، کـــــار لەکەســـــیەتیت
ئـــەکا، ئـــەگینا، پێـــت ئـــەڵێن تـــۆ چـــیت!
ئـــــەم قســـــانەی کـــــە (ســـــاڕێژ) بـــــۆیکردی
کـــاری پێنەکـــەی، زیندووشـــــبی مـــــردی!

هەولێر

٢٠١٦/١/٣١

## کەچاکە ئەکەی

کەچـــــاکە ئەکـــــەی، پیاوانــــــە بیکــــــە
مەبــــە بەدۆســــــتی، ســــــتەمکار چــــیکە
پیـــاو ئـــەبێ جێگـــەی، پەنجـــەی دیـــار بـــێ
کـــــارێکی باشـــــت دی، زووکـــــە بیکـــــە

هەولێر
٢٠١٧/٢/٢٢

## هەست بەمغدوری

هەســــت بەمغـــدوری، بـــێ هیـــوات ئـــەکا
بـــێ هیـــوا خـــۆی تووشـــی بـــەڵا ئـــەکا
کـــــەدڵ ڕارا بـــــو، بـــــێ نـــــەوات ئـــــەکا
کـــە (خواشـــت) ناســـی، بـــێ هـــەوات ئـــەکا

هەولێر
٢٠١٧/٦/٤

# دڵڕەش

دڵ ڕەشکەی ئەبێ، ببێ بەپیاو
تەنیا ڕووی گەشە، ئەویش هەر بەناو
کەی ئەبێ بۆمان، بیەتە سەر ڕێ
چەند بڵێی پیسە، لەدڵ و هەناو
کارێکت پێ ی بێ، بۆت بەدڵ ناکا
دووڕووە بۆیە، دڵم لێی شکا
هەتا تێ ئەگا، تۆش داینێ بەپێ
هیچ کاتێ دڵت، پێیا خۆش نەبێ
پێی خۆش بێ وەك مار، پێوەت ئەداتن
گوشادی و خۆشیت، لەبیر ئەباتن
پارێزی بکە لێ ی نەك بەقسە
ڕازی خۆت مەدە پێی، وەکو دزە
خوایە بێ لەخۆت، کەس تێم نەگاتن
نەوەك یاوەریم، لەدەست بداتن
بەسەرما زاڵ بێ و بمخاتە گێژاو
لەدەستم بدا، باوەڕی تەواو
دوژمنی خودا، زۆرە لەبەندە
بێ تێگەیشتن، پێی مەڵێ مەندە
هەر خودا چاکە لەهەموو بوارێ
داومان لەداوی، بەندە نەئاڵێ
بەندەی وا هەیە، هەر ئەڵێ ی مەڕە
چاوەڕێی بەدی و، پەرپو، گێچەڵە

هـــــەتا ئـــــەتوانی، ڕازی دڵـــــی خـــــۆت
بـــێ لـــەخوا مـــەدە کـــەس، تاکەســـی خـــۆت
چـــونکە ئـــەم ژینــــە، پـــڕ لـــــەدووڕوو وە
چـــاش نـــابن، ڕاشـــهاتوون، لـــەم خـــوە
نایەنـــە ســـەر ڕێ، (خـــوا) دەســـتیان نـــەدا
خۆیـــان لا بـــەرزە و، تۆشـــیان پـــێ گـــەدا
(خوایـــــە) بـــــاوەڕ و، متمانـــــەی (خـــــۆتم)
پـــێ بـــدەی لـــــەژین بەنـــدەکی (خـــۆتم)
ڕوونـــاکی بـــاوەڕ، شـــاد و مەســـتم کـــا
بەچەشـــــەی خۆیـــــا، وەبەهەســـــتم کـــــا
زمـــــان و کـــــارم، لەناهـــــــەمواری
بـــــۆم بپـــــارێزی، بـــــێ شـــــەرمەزاری
تـــا لـــــەلای تـــۆوە و لای بەنـــدە چـــاك بم
لـــــەتیر و تانـــــەی خـــــەڵك، بێبـــــاك بم
هـــــەردەم لـــــــەبۆتا، سوپاســـــگوزاربم
نـــەك لـــەپێش چـــاوی تـــۆ و بەنـــدە تـــاڵبم

هەولێر

٢٠١٧/٢/٢٥

## ڕۆژانی تەمەن

ڕۆژانـــــــی تەمــــــەن زۆر بەبەهایـــــــە
لـــــە بـــــەها و ســــەنگا، بەبێكۆتایـــــە
ئـــــەم مـــــاوەی كەلـــــەش، گیـــــانی تیایـــــە
تاقیكردنـــــــەوەی ژیـــــــنی تیایـــــــە
ماوەكـــــە ئـــــەڕوا، هـــــەر ئـــــەم ســـــاتەیە
بـــــۆ پاشـــــا و گـــــەدا، وەكـــــو یەكوایـــــە
هەســـــتی سەرســـــامیم، لەخەیاڵدایـــــە
لـــــەیادی ناكـــــەم، پـــــێم راســـــتەوایە
چـــــی بكـــــەم (ســـــارێژ) تـــــا لەژینمایـــــە
نەیـــــدیوە ئاســـــتێ، بێتـــــە ئـــــەم پایـــــە
ئـــــەم مـــــاوەی لـــــە بـــــۆت كـــــە تـــــۆی تیایـــــە
ئـــــــەڕوا وەدەروون لەخەیالایـــــــە
دڵخۆشـــــم كـــــەوا، دادوەری مـــــردن
بـــــۆ هـــــەژار، زەنگـــــین، لەئاســـــتێ دایـــــە
وەك یەكـــــە، دەســـــتووری ئـــــەم (خودایـــــە)
تەنانـــــەت لـــــە بـــــۆ كەســـــێ ریســـــوایە
دادوەری خـــــودا، بـــــێ جیاوازییـــــە
بەنـــــدەكی راســـــتبە، گیـــــان لەئاشـــــتییە
بەنـــــدەكی راســـــت بـــــی، دێتـــــەوە ڕێگـــــەت
دڵنـــــەوا ئـــــەبی و خـــــۆش ئـــــەبێ جێگـــــەت

هەولێر
٢٠١٧/٣/١

## کاکە باڵا

باڵا، بەتەنیا (خوات) لا باڵا بی
تا پێش چاو چابی، خەڵکت لا چابی
کوڕە گەورەکەم، لەژین و ریابی
ڕێز بدە خەڵکان، تا گیانت مابی
هەر شتێ ئەگەر، مافی خۆی پێدەی
ڕێزدار ئەبیلام، تا (ساڕێژ) مابی
پێت ئەڵێم چەندی، بڵێی وریابە
(ساڕێژ)ی زامی گەدابیو شا بی

## سووکی

کەسێکی کەمبێو ناڕەسەن بێو سووك
وەبێ بەها بێو بێ سەنگو چروك
ئەمانە کەسی وان، ئیشیان پێت بێ
بۆ کاری خۆیان، گورجن وەلەش سووك
بۆ بەرژەوەندی خۆیان وا ئەکەن!
دەستت ماچ ئەکەن بێ ڕێزن بێ تووك
بەلام هەرکاتێ، دەستی خۆیان دی
وەکو نەتناسن وان وەزۆر بچووك

هەولێر
٢٠١٧/٤/٣

## جیاوازی بۆچوون

ئـــەوەی لـــەلای مـــن گـــران بەبەهایـــە
لای کەســـانی تـــر، ســـووکە ڕیســـوایە
ئـــەوەی کـــەخاوەن، هەســـت و هـــۆش وایـــە
خـــەڵکان دڵنیـــان، کـــەوا دانایـــە
هەرکەســـێ کـــەوا، خـــۆی پەســـند بکـــا
لەســـەر ئـــەم و ئـــەو، تـــا لـــەژین دایـــە
ئـــەم کەســـە لـــەناو، کۆمـــەڵ ســـووک ئـــەبێ
لـــەلای هـــەموو کـــەس، وەك پـــووش و کایـــە
بـــەڵام هەرچـــەندی ڕێـــز لەخـــەڵك نـــێی
ڕێزەکـــە بـــۆ خـــۆت دێتـــەوە و مایـــە
یـــا(خـــوا) نموونـــەی، ئەوانـــە زۆر بـــن
کەســـەنگی هـــەموو کەســـیان لا مایـــە
ئـــەم کەســـە هـــەردەم، خۆشەویســـتە لام
ئەگـــەر گـــەداش بـــێ، لـــەلاما شـــایە

هەولێر

٢٠١٧/٣/٥

## تا ئەگەی بەگوڵ

تـــا ئەگـــەی بـــەگوڵ، ئـــازار ئەکێشـــی
بـــەدڕکو بـــەزی، دەســـتت ئەیەشـــی
ئـــەم کاتـــە تـــامی، بەریـــدار ئەکـــەی
کەمانـــدوبوونی لـــەبۆ بچـــێژی

هەولێر

٢٠١٧/٣/٩

## بێ لێکدانەوە

بــــێ لێکدانـــــەوە، مەکــــــە تــــــەگبیرێ

نــــازی گشـــت کەســـت، پـــێ ڕانــــاگیرێ

کەســـــێ شــــایانی وەی نـــــەبێ کــــەتۆ

بچــــی لــــــەدووی دەی، پێـــــت رانـــــاگیرێ

چـــونکە زیـــاد لـــــەخۆ، پـــێ هەڵئــــەبڕی

پێـــت پــــەیڕەو نـــاکرێ و گیـــان هەڵـــدەدێرێ

هەولێر

٢٠١٧/٣/١٠

## بچووکبویەوە

گێلبــــــی گاســـــــنت، لێ ئەبتـــــــە دەرزی

لەئاســـــت راســـــتیا، گیانــــت ئەلـــــەرزی

پیـــاو ئـــەبێ هـــەردەم، خـــاوەن ئەمـــەك بـــێ

چـــەند کـــەراش خـــوار بـــی، زیـــاتر لام بـــەرزی

ئەگـــەر گـــەورەی خـــۆت، لــــەلا بچـــووك بـــێ

لـــــەهیچ کاتێکــــا، پێــــت نـــاڵێم تــــەرزی

کـــاتی وا دیــــارە، ئــــەبێ چـــرووك بـــی

بۆیـــە شـــــووژنیش بـــی، لام ئەبیـــە دەرزی

هەولێر

٢٦-٢٠١٧/٣/٢٧

## تابان خان

تابـــان خـــان دایکـــی، لاوی و ولیایـــه
بـــۆ کاکـــه بـــالاّ، وەکـــو چـــرایه
زۆر خۆشـــه هاوســـەر هـــەتاکو مایـــه
بـــۆ هاوســـەری خـــۆی، بـــەرزکا پایـــه
ســـوپاس بـــۆ گشـــتتان، کـــه ئامـــادەبوون
لـــەم بۆنەیـــەدا بـــەخێربێن خوایـــه

هەولێر
٢٠١٧/٤/١٢

## ئەڵێن

ئـــەڵێن پوولـــو دراو، هـــەموو شـــت نیـــه
پـــارە پەرســـت بـــی، رەوشـــتت چـــییه؟!
سوپاســـی خـــوا کـــه، لەســـەر وەی کـــۆکی
تێـــر و تەســـەلبی، شـــتێکی دییـــه
پـــارە لەگشـــت بـــار... لـــەبۆت واناکـــا
هـــەموو مەبەســـتت، بـــۆ دابـــین ناکـــا
سوپاســـگوزاری، (خـــوای) بـــێ وێنـــه کـــه
ئـــەوەی پێـــی داوی، کـــەس بـــۆت واناکـــا

هەولێر
٢٠١٧/٦/٤

## رۆژێ

هـــەر ڕۆژ لەگـــەڵ ســـەگ کەوتیـــە چـــاڵێ
هـــەر ئـــەبێ هەرکـــەی، جـــا بەهـــەر بـــارێ
هـــەر ناکـــەی چـــارەت چـــیە و چـــۆن ئـــەبێ
بیـــــەوێ پێـــــوەت ئـــــەدا وەك مـــــارێ
دەتـــــۆش ئامادەباشـــــی خـــــۆت بکـــــە
تـــــاوەکو درکـــــت نەچـــــتە پـــــێ جـــــارێ
وەرە نـــــــاری کــــــــە، هـــــــــەروەکو وڵاغ
بـــــەڕ بـــــەخۆ دادە، تـــــۆ لـــــەپێش تایـــــێ
ئـــەم بـــەڕە ئـــەبێ، چـــەند مـــەتر درێـــژ بـــێ
ئەتکاتـــــە گـــــوڵێکی نـــــاو بـــــەهارێ
بـــێ منـــەت مەبـــە، لەئاســـت هـــەموو کـــەس
هەرکـــەس بـــەپێی خـــۆی، تیایـــا بئاڵـــێ
ببـــە بـــرای یـــەکێك، بـــۆت ببێتـــە بـــرا
جـــا ئیمســـاڵ بـــو بـــۆت، وەیـــا خـــۆ پـــارێ
پیـــاوی چـــاك دیـــارە، بەســـامان نیـــە
پیـــاو پیـــاوە زەنگـــین بـــی یـــا هـــەژارێ
جـــا لەســـەگ دوور بـــە ناوەکـــەی بـــەدە
لەهەڵســـــووکەوتا، هـــــەر تێـــــی مـــــەئاڵێ
پـــــــارێزی بکـــــــە لەکـــــــەموکوڕی
تـــــا شـــــیرین بییـــــو نەنۆشـــــی تاڵـــــێ

هەولێر

٢٠١٧/٦/٤

# ژنی باش

ژنـــی بـــاش هـــەردەم، پەرێشـــانە بـــۆت
کـــە بـــاش بـــو خۆشـــی ژیانـــە لـــەبۆت
ژنـــی بـــەد، هیـــوای بـــەس نەمانـــە بـــۆت
کەبـــەد بـــو هـــەردەم، دەرد و ژانـــە بـــۆت
ژنـــێ پەســـند بـــێ، وەك ســـامانە بـــۆت
ویســـتی نـــا پەســـند، دارمانـــە بـــۆت
ژنـــی بـــاش، بـــۆ رازت، قەڵغانـــە بـــۆت
هـــەمان کـــات بـــاغی، گلســـتانە بـــۆت
نۆشـــی ژنـــی بـــاش، وەك وچـــانە بـــۆت
پێـــت ئـــەڵێم وەك خۆشـــگوزەرانە بـــۆت
ژنـــی بـــاش هـــەرگیز، (خـــوا) پێدانـــە بـــۆت
وەك بـــاغی گـــوڵو، بـــۆن ڕەیحانـــە بـــۆت
رەفتـــار لـــەبۆ ژن، شـــان بەشـــانە بـــۆت
شـــان بەشـــان (المـــاس) وە (مەرجانـــە) بـــۆت
جـــوانی بـــەرەفتار، (بەخشـــی خوانـــە) بـــۆت
(چـــی لـــەلای خـــوا بـــێ،) دیـــاری جوانـــە بـــۆت
(چـــی خـــودا بیکـــا)، گـــران بەهایـــە بـــۆت
کـــەپێی رازی بـــوی، هانـــای باشـــە بـــۆت
دڵنـــەوات (بـــەخوا)، زۆر ڕەوایـــە بـــۆت
چـــاوی (بەخشـــندە)ی، پارێزرانـــە بـــۆت
لای خۆشەویســـت بـــی، کەمدوانـــە بـــۆت
(خـــوا) پێتـــی بەخشـــی، دوور بەلایـــە بـــۆت

(خـــوا) خۆشـــی بـــوێی، خـــۆش ژیانـــە بـــۆت
دوو ڕاڕاییییـــــە و پشـــــت و شـــــانە بـــــۆت
ژن لـــــەبۆ پـــــیری، وەك گۆچـــــانە بـــــۆت
کـــەبۆت لاســـار بـــو، هـــەر زیانـــە بـــۆت
تیمـــــاری دڵـــــەی گومانـــــدارە بـــــۆت
لـــــەژین ڕوەتـــــی ســـــەر جیهانـــــە بـــــۆت
ژنـــــی بـــــاش وەکـــــو، چـــــراخانە بـــــۆت
دەرکـــــی شـــــانازی، ســـــەر زمانـــــە بـــــۆت
پێـــــی رازیبـــــی پێـــــی، زۆر جوانـــــە بـــــۆت
(لـــەلای خـــوای گـــەورە)، دوور بەڵایـــە بـــۆت
(میهرەبـــانی خـــــوا)، دووری ژانـــــە بـــــۆت
گەشـــبین بـــی پێیـــا، هـــەر ئیمانـــە بـــۆت
مێـــــوان چ مێـــــوان هـــــەرکاتێ کـــــەهات!
کـــەژنی بـــاش بـــێ، جـــێی چـــاوانە بـــۆت
(چـــاوەدێری خـــوا)، بـــۆت شـــێوەی نیـــە
پێیـــــدای ڕەوایـــــە وەك دەرمانـــــە بـــــۆت
(خـــوداش) پێـــت نـــەدا هـــەر پێـــت ڕەوابـــێ
کـــاری (خـــــوا) گشـــــتی ڕەوایـــــە بـــــۆت
(خوایـــــە) ژیانمـــــان پـــــتر ئاشـــــتەوایی
بکـــەی بەبـــەرزی نـــاوی جـــوانی (خـــۆت)

هەولێر
٢٠١٧/٥/٣

## سۆنە تەڕ نابێ

بیستوومە، کەوا سۆنە تەڕ نابێ
دارێ بەردار بێ، بەبێبەر نانێ
بەردار بێ و بەبێ بەر بێ لات وابێ
جێگەت لێ ئەگرێ و پێشت چا نابێ
بەڕکی ئارامگر، کەباغەر قووڵە
کەبەڕکی قووڵبو، هەر لەلات چابی
پیاوی ئارامگر لەلات بالابی
ئەبێ ڕێزیشی وەکو ئالا بێ
دڵی چاکەکار ئەبێ والابێ
دووڕوو نەبێتو وەك مام و خاڵ بێ
دەستووری ژیان، هەر ئەبێ وابێ
کەسێ کەوابو، هەر ئەبێ چا بێ
کەکەسێ چا بو، نەیبو گەداش بێ
بەهای لەلامان، ئەبێ وەك شا بێ
سۆنەی بێئەمەك، ئەبێ وەك کابێ
هەر سەنگی نەبێ هەتاکو مابێ
ئەم قسەش هەردەم بەدووڕوو ئەڵێن
دووڕوو بێسەنگە هەتاکو وابێ
پیاو بە لەم ناوە پیسە بەدووربە
هەتا کەسیەتیت لەلام بالابێ

هەولێر
٢٠١٧/٦/٢٦

## ستەمکاران

ستەمکار گشتی لەناو ئەچێتن
فیلان، کەرکەدەن، هەمووی ئەمرێتن
ستەمکار بڵێ، تۆ بەچی ئەخوڕی!
تێناگا بۆیە ڕۆژێدێ ئەگری
یا (خوا) ستەمکار هەر ناگزول بێ
تاڕوو شکاو بێو بێ زمان بێتن
تۆ چیبچێنی، ئەمەش ئەدروی
ستەمکاری بەد، با پێم بڵێتن
کەبەدڕەوشت بو هەر نازت ناگرم
شون هەڵگرانت بمرن لەرێتن
لەتاریکی یا، هەر لاڕێ ئەگرن
گشت ستەمکاران سەر ڕەقن ئەخوڕن
گۆشتم گرت بەوەی درۆزن شکاوە
پێم گێلە کەسێ، نازت بگریتن
ئێستاش من ڕازی تۆ نادرکێنم
تاکو کەسیەتیت لێ نەڕووخێتن
تۆ پێبزانی یا لێم یاخیبی
لەبەر  خوا زمان ناوت نابینێتن
(خواش) بەگەورەیی (خۆی) دەستەبەر بێ
کەپەیڕەوکارە (ساڕێژ) ئەڵێتن
منیش هەموو دەم، سوپاسگوزارم
ئەی (خودا) بۆ (تۆ)، بەندان لەڕێتن

**(خوایـــە) هـــەر بـــەتۆ، ئـــەکرێ بـــەم شـــێوە**
**دیاریخــــەی بـــــەدکار لێــــی بشـــــێوێتن**
**ئـــەوەی گۆشـــت خـــۆرە، گۆشـــتی نـــاخورێ**
**بـــەڵام گۆشـــت نـــەخۆر، گۆشـــتی ئـــەخورێتن**
**نـــاز و ڕێزلێنـــان پەیوەســـت نـــین بـــەماڵ**
**بێمــــاڵیش ڕێـــزی هـــەر پـــێ ئـــەدرێتن**
**(خـــوا) بـــەرز و بـــاڵات کـــا، گوشـــاد ئـــەبی**
**(خـــوا) شکســـتت کـــا، ڕوشـــت ئەشـــکێتن**

**هەولێر**
**٢٠١٧/٦/٢٣**

## پیاوەتی

پیاوەتی بەزار سووکو ڕیسوایە
ئەنجامدەرەکەی لەخۆشیدایە
گەر لێم بپرسی بڵێی بۆ وایە؟
ئەڵێم چاکەکار ئاستی هەر وایە
بەلآم درۆزن بیو، بەس بەزار بڵێی
ئەمکارە ئەکەم سەنگت وەك کایە
وریابە بەخۆت هیممەتت هەبێ
کەسیەتیت بگرە تا نەڕوخایە
پیاوبە بەس بەزار، پیاوەتی ناکرێ
درۆزن هەر سووکە و بێ بەهاو پایە
پیاو زۆر نارێکە کەوا درۆزن بی
درۆزن پیاو نیە، سووکە تامایە
نامەردە، بەدە، ڕوو زەردە هەردەم
ساختەچیو، قوڵبڕ، دێرە بەبایە
بەسنیە زیاتر داشۆرین لەبۆ
درۆزنی بەدکار، کە ئاستی وایە
فێڵو تەڵەکە، بەڕاستگۆ ناکرێ
واڕاهاتوە و ڕاستو ڕەوایە
ڕاستگۆ خوێنمە، وەپشتمە، دڵمە
چونکە ڕاستگۆیە، بۆ (خوا) سازایە
کەبۆ (خوا) سازا گرانبەها ئەبێ
لەلای (خوا) لەخۆشەویستیدایە

راســــتگۆ گلێنـــەی چـــاومە، بینامـــە
لـــەلای مـــن ســـەنگی، لەبـــەرزی دایـــە
بـــەلای مـــن درۆزن، ئـــەڵێی خەســـایە
چـــونکە هـــەموو دەم، لـــەم پیشـــە دایـــە
پارســـــەنگی راســـتگۆ، لـــەدرۆزن دوورە
ســـەنگو ئاســـتی درۆ، زۆر بـــێ بەهایـــە

هەولێر
٢٠١٧/٦/٢٥

## هەروەك ئەبینم

هـــەروەك بـــزانم، لـــەلای مـــن وایـــە
کـــەمردن لـــەڕێی، گشـــت ماڵـــێ دایـــە
پیـــاوەتی بکـــە، لـــەراهی (خوایـــە)
مـــردن لای گـــەدا و وەلـــەلای شـــایە
سەرمەشـــقی ژینـــت بکـــە بەچـــاکە
ئینجـــا (خـــوا)ش لـــەبۆت، پشـــتە پەنایـــە
کـــار نەکـــەی کـــارت لێئەبتـــە چـــیا
ماندوونـــەناس بـــی، کارتســـانایە
هەرچـــەندی ڕشـــتبی لەپیشـــە و کـــارت
ئـــەی (ســـاڕێژ) گیانـــت لەخۆشـــیدایە

هەولێر
٢٠١٧/٦/١٢

## لاساری

کەســـــێکاری خـــــۆی، پیاوانــــــه نـــــەکا
بـــــــەڕێکوپێکی، ئـــــــەنجامی نـــــــەدا
پیاویشـــــبێ ئـــــەڵێم هـــــەر بەروخســـــاره
چـــــونکه بـــــوار، بەناتـــــەواوی ئـــــەدا

هەولێر
٢٠١٧/٣/٣٠

## قەرزاری

نەمـــــدی لەقـــــەرز کـــــۆڵ گـــــرانتر بـــــێ
وەك دیـــــتم، ئـــــەبێ وەکـــــو ئـــــاگر بـــــێ
گشـــــت گیـــــانی قـــــەرزار، دائـــــەمرکێنی
خۆشـــــی نامینـــــێ، بـــــۆی ڕێگرئـــــەبێ

هەولێر
٢٠١٧/٣/٣٠

## خراپە

خراپـــــەك بـــــەملیۆن، چـــــاکەی ســـــڕیەوە
هاتوچـــــۆی نێـــــوان، دۆســـــتی بڕیـــــەوە
پەیڕەوکـــــەری بـــــەد، ئـــــەڵێی لەخـــــەوە
خـــــۆی بـــــێ ئەمەکـــــە، لـــــەدڵیا شـــــەوە
مـــــراز باشـــــی دڵگـــــۆی خـــــۆی بـــــردەوە
چـــــونکه گەشـــــبینە هـــــەردەم پێشـــــڕەوە

هەولێر
٢٠١٥/٥/١٥

## وەرە پێکەوە

وەرە پێکەوە، دۆستی یەکتر بین
سەنگییەك ڕاگرین، نەوەك لێکترین
لەپێناو مافمان، ماندو نەناسبین
لەهاوبیریا، بۆ یەك جێگرین

هەولێر
٢٠١٧/٦/٩

## ئەبینم

ئەبینم نەزان، زمانت لووسە
لەگفتوگۆدا هەروەکو مووسە
هیچ هەلێك نادەی، لەکاتی دوان
خۆت پێبەرێزە و، خەڵکت لا پووشە

هەولێر
٢٠١٧/٧/٨

## بەگۆتە گۆتە

بەگۆتە گۆتە، دڵئەبتە ڕاڕا
مەڵێ ئەنجامی، پێگەیی کوا
لەبۆ هۆشمەندان، ئاڕاستەك بەسە
پیاوی ژیر و ڕاست کەسی گشت کەسە

هەولێر
٢٠١٧/٦/٩

## لەکەتنی خۆ کرد

لەکـــەتنی خـــۆ کـــرد، کـــڕ و بێـــدەنگ بـــە
لەشـــەڕی دەســـتکرد، هـــەر دووری جـــەنگ بـــە
لـــەکار و پیشـــەت، لەچەشـــنی هـــەنگ بـــە
بەئاراســـتەی بـــەد، پەســـتو دڵتـــەنگ بـــە

هەولێر
٢٠١٧/٦/٩

## وابە بۆم

بـــەزار ناخۆشـــی، مەخـــە جێـــی خۆشـــی
وابـــی لـــەم خۆشـــیە، ئـــازار ئەنۆشـــی
پەنـــد وەرگـــرە کاتـــێ، هـــەڵت بـــۆ ڕەخســـا
دان بـــەخۆ بگـــرە، هـــەر بەچاوپۆشـــی
دڵ دانامرکـــێ، دەروون ئاگربـــێ
بـــۆ ئـــەنجامی بـــاش، ئـــەبێ تێکۆشـــی
ئێســـتا بڵـــێم چـــی، کەپووشـــو نـــەوت بـــی
کـــە... ورەت نـــەما، ئـــازار ئەنۆشـــی
چـــەند خۆشـــە مۆخـــت بـــەکاربهێنی
گـــەش ئـــەبم، بتبیـــنم بـــەڕوو خۆشـــی
تکامـــە تکـــا، بســـازێ لـــەبۆم
لاســـاریمەکە، پێـــی فەرامۆشـــی
کـــەی ئـــەبی بەکـــەس، خـــاوەن بـــیر و هـــۆش
دوور ئەکەویـــەوە، زوو لـــەبێ هۆشـــی
چـــونکە بێهۆشـــان، بەرژەوەنـــدی یـــان
نادیـــارە لایـــان، نـــابینن خۆشـــی

خـــەنی ســـەد خـــەنی، لـــەبۆ ئـــارامگر
کەهـــەر ســـوودمەندە و خێـــر کەوتـــە کۆشـــی
زمـــان شـــیرین بـــە، دڵ مەڕەنجێنـــە
وانـــەبی ئـــەڵێم ئـــەتۆ بێهۆشـــی
دەبـــا هەریـــەك بـــین، رووی یـــەك نەشـــکێنین
بـــا مـــام و خـــاڵ بـــین، بـــژین لەخۆشـــی
پیـــاوێ پیـــاو بـــێ کـــار پشـــتگوێ ناخـــا
لـــەم هەڵـــەی هـــەیتی، تـــا بەرووخۆشـــی
ژیـــان و رووداو، بۆمـــان ئەســـووڕێ
یـــەك ئاغـــا و، یـــەکێ مـــاڵات ئەدۆشـــی
لەهەڵوێســـتی خـــۆت، پەشـــیمان مەبـــە
هـــەوڵت مەهێنـــە ســـەر (ســـفر) و (بۆشـــی)
کەواتـــە بـــاغر مەبـــە، بەپیشـــەت
لەتۆڵـــە لادە، ڕووم لێبپۆشـــی
وابکـــە کـــەوا، پێـــت دڵنـــەوابم
چـــونکە ئـــەبینم، تـــۆش بـــۆم پەرۆشـــی
بزانـــە ژیـــان، پێـــنج و دوو ڕۆژە
خۆشـــە بســـازێین، بەجگەرگۆشـــی

ع

٢٠١٧/٤/١٦

# ئاشکرایە

لەمەی ئەیبینی و وەروو ئەداتن
لەبەرهەمی مریشک، بۆت دیار ئەخاتن
مریشک هێلکەش و جیقنەش ئەکاتن
شادە ئەم کەسەی هێلکەی ئەخواتن
بەڵام ئەم کەسەی بۆنی جیقنەکەی
ئەکا بۆنەکەی کاسی ئەکاتن
ئەم کەسەی کەهێلکەی لێئەخواتن
ناوی بەچاکە و، بەپیاو ئەباتن
بەڵام جیقنەکەی، بەبەر کێ کەوی
بەرکەوتیش مریشک، بەدناو ئەباتن
خۆ ئەمە دیارە، زۆر سروشتییە
سوودمەند بەهێلکە، رووی گەش ئەکاتن
هەرکاتێ تووشی، زەڕ و زیان بوی
ورەت نەڕووخێ، ئەمەش ئەڕواتن
(خوا) چی بۆ هێنای، سوپاسی بکە
ڕووەت دڵخۆشی ژیان ئەداتن
گەورەیی و توانا، هەر لەبۆ (خوایە)
پیاوە ئەم کەسەی، بڕوا ئەکاتن

٢٠١٧/٥/٢٩

# بەهاری ژیان

وەرزەکـــــانی ژیـــــن، وەك وەرزی ســــاڵە
چـــەند هـــەنگاو خۆشـــە و، هەنـــدێکی تاڵـــە
وەرزەکـــــان وەرزی، بـــــەهار و هـــــاوین
ئینجـــا پـــایزە، زســـتان لــــەش ساردین
لەتەمەنمانـــــــدا، هـــــــەر کەبـــــــەهارە
لــــــــەلامان خۆشــــــــە، وەشـــــــکۆدارە
شـــانازی ئەکـــەین، پێـــوەی بـــەخۆمان
بەشـــۆخیو هێـــز و، بـــەجوانی خۆمـــان
چـــونکە بـــەهاری ژیـــن پێـــوەی دیـــارە
بەجموجۆڵـــــــــــە وەبـــــــــــەکردارە
پـــــێی ئـــــەزانین و دەســــــەڕۆیت تیـــــا
تەمــــەنمان لــــەم وەرزە هەرکــــەڵ ژیــــا
کەواتـــــــە بـــــــەهار وەرزی جوانیـــــــە
وەرزێکـــــە بـــــۆ خـــــۆش گوزەرانیـــــە
ئێســـــتا زانیمـــــان، لــــەوەرزی بــــەهار
خۆشـــی ئەنۆشـــین، لێـــی نـــابین بێـــزار
لــــەپاش بــــەهار، کەوتینــــە هــــاوین
لــــەناو تەمـــــەنمان، کــــەتیای ئــــەژین
هــــاوین واتاکــــەی وایـــــە، کەگەرمــــە
گـــەنج لـــەهاوینی تەمـــەن، بـــێ شـــەرمە
بەشــــەرمی واتـــای وایـــە، چاوپۆشـــە
لــــەکار و پیشــــەی، بەهەســــت و هۆشــــە

هاوینی تەمەن، هەر بەرەو قووڵە
بەرەو گەرماییە وەك دۆڵ بەدۆڵە
بەرزی بەمانای، ئەوپەڕی هێزە
لەناخی خۆیا، خۆی لا بەپێزە
گوتم بێ شەرمە، نەك بەبێ ڕەفتار
پێ هەڵنابڕێ، لەکار و کردار
هاوینی تەمەن، ئەوپەڕی توانا
نیشانمان ئەدا، لێی دیارە زانا
کەگەییە پایز، لەناو تەمەنیا
هەر ئەڵێی مردن، ئەگرێ گەردەنیا
پایزی تەمەن، بەرەو خوار ئەڕوا
هەر وردە وردە، ژیانت ئەخوا
وەکو کێوێکە، کەبن کوڵی کەی
کاتی ڕمانی، پێیا ئەبا پەی
بینیم بی هێز بوو وا ئەم تەمەنە
پایز سست ئەبێ، لەئەم زەمەنە
ئینجا هەر وردە وردە ئەبینی
زستانی تەمەن، دێ لەبۆ ژینی
کاتێ کەزستان هات، ڕووی تێ کردی
بزانە تەمەن ئەبا بەخورتی
زستانی تەمەن، وا بەرەو لێژی
ئەڕوا تا ڕۆژێ، مەرگ ئەچێژی
هیچ کەس لەمردن، ڕزگاری نابێ
چوار وەرزی تەمەن هات کەکۆتا بێ

چـــوار وەرزی تەمـــەن، چـــوار وەرزی ژینـــە
چەشـــــنی چـــوار وەرزی ســـاڵە بیبینـــە
کەتەمـــــەن کەوتـــــە، بـــەرەو ڕووی کـــەمی
واتـــە لەزســـتان، خـــۆی پـــێ ی دای غـــەمی
لـــــەکۆتا ئـــــەتبا، بـــــەرەو گۆڕســـــتان
ئـــــەتۆرێ ی لـــــەباغی، گـــــوڵ و ڕەیحـــــان
لـــــەناو دۆشـــــــەگ و بـــــالیفی ماڵـــــێ
نامینـــــێ ی ئەکەویـــــە گـــــۆڕ وەك چـــاڵێ
لـــــەناز و خۆشـــــی و کـــــەیفی ماڵـــــەوە
ئەکەویـــــە نـــــاو گـــــۆڕ دەم بەناڵـــــەوە
لـــەناو کـــەس و کـــار، بـــەڕێز و خۆشـــی
تـــــەنیا ئـــــەمینێ ی کەمـــــەرگت نۆشـــــی
(خـــودای) بـــێ هاوتـــا، (خـــودای) میهرەبـــان
بەخشـــندەبی بـــۆم (خـــودای) گشـــت جیهـــان
(خودایـــە) پـــەنا، بـــەس بـــۆ (تـــۆ) دێـــنم
دەروونـــــی پیســـــم، نەکەوتـــــە بـــــەینم
کـــەنزام هێنـــا، بـــۆ (تـــۆی) بـــەتوانا
نـــــزام بتگاتـــــێ، لـــــەکاتی هانـــــا
لەنێوانمانـــــدا، هـــــیچ دەروونـــــی پـــــیس
نـــەبێ، چـــونکە خـــۆی، نەحســـەوە نگـــریس
هـــــەموو ئەینۆشـــــین، تـــــالاوی مـــــەرگ
رۆژێـــــدێ، کفنمـــــان کـــــەن بەبـــــەرگ
هـــەر چـــاکە بکـــە، سەرمەشـــقی ژینـــت
پشـــــت بـــــدە بـــــاوەڕ، وەبـــــەئایینت

خوا بیویٚی، سەرکەوتنی تیایە
سەرکەوتن کەهات، ناخت وەك شایە
هەرچەندی بژی، تا دنیا مایە
(خوات) لا بیٚ، دڵت لەخۆشیدایە
کە (خوا) ڕازی بو لیٚت، سەرفرازی
لەدۆزەخ دووری وەهەر دەربازی
(خوا) باوەڕی وامان پیٚدا وابین
تا ئیٚستا و پاش مردنمان هەر وابین
بەگشت کەس، ڕەزامەندی نادریٚ
ڕەزامەندی (خوا)، کەبو نابڕیٚ
کەسەرفراز بوم، دڵیشم مەستە
ژینم لەپیٚناو، (خودا) پەیوەستە
لەشیٚنەیی هەر یادی (خوا) ئەکەم
تا لەتەنگی دەربازم کا لەغەم
هەرکەسیٚ کەوا، (خودای) لەبیرە
هۆشمەندە، بەتوانایە، وەژیرە

هەولیٚر
٢٠١٧/٧/٧

## کاتێ

کاتـــــێ ژمـــــارەی عــــەیبی تـــــۆ زۆرە
رازی[1] خـــــەڵکانیش مــــــەڵێ لەتۆڵـــــــە

رازت پــــێ ســـووک بـــێ، بیــــدە بەکۆڵـــە
رازی خـــــەڵکانیش مـــــەدە لەدۆڵـــــــە[2]

هەرکەســــێ شـــــەرمی بەعــــەیبی هــــەبێ
چـــۆن بـــێ، پێمگەمـــژە و بـــێ نرخـــە رۆڵـــە

هەولێر
٢٠١٧/٧/٩

(١) راز: سڕ
(٢) دۆڵ: دەهۆڵ

## بەکەس هەڵمەڵێ

بەکـــــەس هەڵمـــــەڵێ، هـــــەتا نـــــەزانی
چـــی لـــەبار دایـــە، لەئەســـتۆ و شـــانی
کـــەی بەتـــەواوی، ئاســـتی ویـــت زانـــی
لەمحـــــــــەکی دە، بێپەشـــــــــیمانی

هەولێر
٢٠١٧/٧/١٢

## سەرکۆنە (لۆمە)

کـــــه مــــن ئــــەتبینم وەکــــو چـــاکەکار
ئــــەبێ خۆشەویســـت بـــی لام نـــەك بـــەزار
پــــــێم دڵنەوابــــــه و، مەبــــــه بــــــەزۆردار
ئێســـتات زۆر خۆشــتر بــێ لەســاڵی پـــار
کەســـــێ وانـــــەبێ، ئـــــەڵێم بـــــێ شــــومار
مەغـــــدووره لــــەژین، ڕەشـــــبینه وەك مــــار
کەهێنامـــــــه ڕێـــــز، زینــــــدەوەری هــــــار
خـــــۆی دانووســــــاوە، بــــــوە چــــاوەنواڕ
کەواتـــــه، هـــــەردووکمان، وەك پێویســـــتکار
ئــــەبێ یــــەك دڵ بــــین و شـــیرین نــــەك تـــاڵ
تــــا خۆشــــنوودەی یــــەك بــــین نــــەك بێـــزار
ئــــاوێزان چــــاکەش بــــین، بــــبین دڵــــدار
دڵـــدار بـــین بۆچـــی؟ بـــۆ خۆشـــی گوفتـــار
سوپاســــــگوزاربین، بـــــــۆ پـــــــەروەردگار
کـــــــەوابم کامـــــــــەرانم وەعـــــــــەودار
وەك یـــــــەك، ئـــــــەبینم قســـــــەی دڵ و زار

هەولێر
٢٠١٧/٧/١٠

## چاکە بۆ ڕەسەن

چاکە بۆ ڕەسەن، وەك مولکە لەبۆت
لەگەڵ ناپیاویش، هەر دەتریزێنێ
لەگەڵ چاکەکار، چاکە بەرگە بۆت
بۆ بەدکار، چۆنبی! دەشت ترسێنێ
ناڕەسەن پیسە، وەکو چرکە بۆت
خۆی بەبەدکار و، قوڵبڕ ئەنوێنێ
ڕەسەن لەخوێنتە، نزیکە لەبۆت
نامۆ پێت لەتەختەی چروك دێنێ
لەگەڵ خراپەکار، ببڕە هامووشۆت
وانەکەی، گیانت، گشت ئەسووتێنێ
لەگەڵ پیاو پەیوەندیت وەك گوڵبکە
لەبەروەی ناپیاویش، دڵ دەهەژێنێ
لەکۆتا خۆشت، خۆشنوودەی دڵکە
زمانی (ساڕێژ) دڵخۆش ئەدوێنێ
برادەری بەدیش، لەڕێزی کلکە
لەژێریا پیسی تیا دەردێنێ
چۆن رزگار ئەبم، لەم پیسی و چڵکە
تا دڵ گوشادی و، خۆشیم بۆ بێنێ
منیش بۆ ڕاستی، ئەڵێم گوێ شل کە
دوو گوێچکە و زمانێك، ئەتدوێنێ
دوو قسان ببیە، هەتە دوو گوێچکە
زمانە، تەنگیو خۆشیت بۆ دێنێ

هەولێر
٢٠١٧/٦/٢٧

## گەیین بەبەرزی

ئەتـــــەوێ بگـــــەی بەبـــــەرزی بـــــێ غــــەم
بگەیـــــە خۆشـــــی بەئـــــەرکێکی کــــــەم
نەخشـــەی کێشـــراوت جـــوان بگـــری لەچـــەم
وێنـــەی قەشـــەنگ بـــو کێشـــات بـــێ وەرەم
هـــەوڵت لـــەدوا دا پـــاش ویســـتی (خـــوا) هـــەم
تـــاکو پێـــی گەشـــبی لـــەدڵ بســـڕی تـــەم

هەولێر
٢٠١٧/٧/١٣

## بەهرە

بـــــەپێی توانـــــات بـــــەهرەت پـــــێ دراوە
گەشـــبە بەچـــێژی، تـــا ژینـــت مـــاوە
سوپاســـگوزاری، بەخشـــی (خـــودا) کـــە
(ســـاڕێژ) بەهرەمەنـــد، وەك گـــوڵ ڕواوە
بـــەڵام (خـــوا) پێـــداو گـــەر پێنـــەزانی
بەبـــەهرەی جـــوانی، لاســـارە خـــاوە
پـــێش کـــوێر خەزنـــەبێ، شـــەق بـــۆی ئـــەهاوێ
نایبینـــێ، بۆیـــە گەشـــەی نـــەماوە
بـــەهرە دێتـــە کـــار زو بەســـەرهەڵدان
ئەگـــەر بەهرەمەنـــد نەیخاتـــە دواوە
بەهرەمەنـــد توانـــادار بێـــدیارە
بەهونەرەکـــەی، گەشـــەی پێـــداوە
کەزانینەکـــەت خســـتە بـــەر کۆشـــش
بـــەهێزیش ئـــەبێ، لـــەلام وەك لاوە
چەشـــە و تـــام و چـــێژ، زۆر لـــەخۆی ئـــەکا
بـــەجوانی ئـــەمینێ، وا لـــەم لاوە

هەولێر
٢٠١٧/٧/١٤

**قال النبی محمد صلی الله علیه وسلم: لا یلدغ المؤمن من جُحرٍ واحد مرتین.**

## هەڵەی دووبارە

**بـــەپێی فـــەرمانی، ســـەروەری نـــازدار**
**جـــارێ پێـــوەت درا، نەیکەیـــە دووجـــار**
**هـــەمان هەڵـــەت کـــرد، لـــەبۆ دووەمجـــار**
**چـــونکە نـــەبوبوی تـــۆ بـــەباوەڕدار**
**بـــاوەڕدار لەفـــەرمان ســـەروەری خـــۆی**
**هـــەر یـــاخی نابـــێ نەبـــەدڵ نـــەزار**
**سیســـتەمی فـــەرموودەی پێغەمبـــەرت**
**ســـەپانتە ســـەرخۆ لێـــی نـــەبی بێـــزار**

**هەولێر**

**١٩-٢٠١٧/٧/٢٠**

**قال النبی محمد (ص) اعطو الاجیر اجره قبل ان یجف عرقه.**

## کرێ

**کـــاری بـــەکرێ ئـــەدەی کرێـــی خـــۆی**
**پێبـــدە هـــەردەم کەمافـــە لـــەبۆی**
**لـــەکاتێکی وا کرێکـــەی پێـــدە**
**پـــێش وشـــکبونی ئارەقـــەی لـــەش بـــۆی**
**ئەمـــەش فـــەرموودەی پێغەمبەرمانـــە**
**پـــیرۆزە لامـــان فـــەرموودەی و خـــۆی**

**هەولێر**

**١٩-٢٠١٧/٧/٢٠**

# كار كەسیەتیتە

كـــــارت ئەبێتـــــە، كەســــــیەتیت لـــــەژین
دڵـــــت فـــــرەوان بێـــــو باغـــــەرت بـــــەرین
بەهــــەوڵو كۆشـــش ســــەرقاڵ بـــە هـــــەردەم
كــــارت مەخـــــەرە، پشـــــتگوێ بەبێغـــــەم
خـــۆت بكـــە دۆســـتم، دۆســـتێكی هـــاودەم
بەكۆششـــــی بـــــاش، چ زۆر وەیـــــا كــــەم
كــــەموو كورِیشــــت، كـــــەمتر بكـــە و كـــەم
بەهــــەوڵو كۆشــــش، لابـــــە گرێـــــی غـــــەم
ئـــــەبێ هـــــــەموو دەم ئـــــــەوە بزانـــــــی
كــــــارا بیــــــو نەچـــــێژی پەشـــــیمانی
وەك ئـــــەڵێم وابـــــی، دڵســـــۆز و كــــــارا
هــــــەر بـــــەرز ئـــــەبی وەك مــــەڵ بــــەبالا
كەســــــیەتیت هـــــەردەم لـــــەكارت دیـــــارە
ئـــــەوەی لاســـــار بـــــێ، پێـــــی شــــــەرمەزارە
بەنـــدەی خۆشـــنوودەی لای (خــــواو) بەنـــدە
نـــــەرم و دڵســـــۆز بـــــێ وەدەم بەخەنـــــدە
ســــوودی بـــۆ خۆیـــو خـــــەڵك بێـــــدیارە
بــــــــۆ رِەزامەنــــــــدی پــــــــەروەردگارە
(ســـارِێژی) بەنـــدە ئـــەڵێ (خـــوا) یـــار بـــێ
بـــــەزار تـــــا بـــــەكار، هەڵوێســـــتم دیاربـــــێ
شـــــانازی و نـــــازم، رەنـــــگ بداتـــــەوە
لــــــەكاری پوختــــــەم پەنگبداتــــــەوە

تــــــەنیا ئـــــاواتم لای (خـــــوا) لـــــەکارا
ڕازی بــــــی لێمــــــا، (پـــــەروەردگارا)
متمانـــــەم پێـــت کـــرد، تـــۆم کـــردە جێگـــر
کـــەوا لـــــەباتیم، هـــاودەنگ بـــی بـــەبیر
تـــــۆش تـــــەنیا دوان نەبتـــــە بنچــــینەت
دڵســـۆز بـــی لـــەبۆم، بـــەڕێز بـــێ مننـــەت
پیـــــاو کەمتمانــــــەی پێـــــدرا جـــــارێ
ئـــەبێ ســـەرقاڵ بـــێ، بـــەس تـــێ نـــەئاڵێ
ئـــەوەی کـــاری جـــوان، لەدەســـتی هەڵســـێ
شـــانازی ئـــــەکا و، نایـــــدا لەدەســـــتێ
بـــەس سمـــێڵ و ڕیـــش ناتکـــا بـــەپیاو
هـــەوڵی لێ دەرچـــێ، بـــێ ســـوودە وەخـــاو
چـــونکە مـــەرجی ڕاســـت، لـــەکار و پیشـــەت
لەهەڵوێســـــت دیـــــارە، ببـــــە بلیمــــــەت
ڕەســـــەنی ســـــەرقاڵ، لــــــەکار هەمیشـــــە
وەســـــتانی نیـــــە، بـــــۆی بویتــــە پیشـــــە
مانـــــدوو نەناســـــە و، ســـــەرکەوتن دێنـــــێ
ئیمـــــڕۆی باشـــــترە، زۆر زۆر لـــــەدوێنێ
هـــــەوڵو کۆششـــــت، ڕەگـــــو ڕیشـــــەت بـــــێ
شـــانازیت بـــــەزار نـــــا.. لەپیشـــــەت بـــــێ

هەولێر
٢٠١٧/٦/٢٤

## محەكی پیاو

پیـــــاوی ترســــــنۆك هـــــەموو ڕۆژ ئـــــەمرێ
ئـــــازابی، لـــــەژین یـــــەك جـــــاری ئـــــەمرێ
پیـــــاوی مـــــەرد بـــــەرگی نـــــامۆ دائـــــەدڕێ
لەتەختـــەی چـــروك پـــێی خـــۆی هەڵئـــەبڕێ
پیـــــاو حـــــەیای نـــــەبێ، نـــــاوی زو ئـــــەزڕێ
وەبـــــەری قســـــەی نـــــامۆ و ســـــووك ئـــــەگرێ
پیـــــاوی شـــــڕ دەرگـــــا بەخـــــەڵكی ئـــــەگرێ
لەلایـــــەن ئـــــازاش، بەرپەرچـــــی ئـــــەدرێ
پیـــــاو كەڕەســـــەن بـــــو ڕێـــــزی پـــــێ ئـــــەدرێ
چاوپۆشـــــە بۆیـــــە، پایـــــەی پـــــێ ئـــــەدرێ
كەســـــێ چـــــاوپۆش بـــــێ، لـــــەبۆ ئـــــەمو ئـــــەو
لەنگـــــــەریش بەكەســـــــیەتی ڕائـــــــەگرێ

٢٠١٧/٧/٣

## بۆ وابوم

لەبـەر ئـەركی ژیـان بـۆ مـن، كەویسـتم چـاو بپۆشـم لێـی
لەبـــەر زەڕ و زیـــانی بـــو، كەویســـتم لەكـــەمین بم لێـــی
لەبەر سەنگی بەڕێزان بو، كەویستم خۆش خواز بم بۆی
لەهاوسـەنگی كیـانم بـو، كەویسـتم مـن پـەرۆش بم بـۆی

هەولێر
٢٠١٧/٨/١

# کاری بەسوپاس

کــــاری بەســــوپاس، بـــــەئازار ئـــــەڕوا
هـــەمان کـــار بـــەپول، ســـانایە بـــە(خـــوا)
پولـــدار ڕووســـووره و، خـــەڵك دەســـت بەســـنگ
ئـــــەبن لـــــەبۆیا، پـــــێم بکــــــە بــــڕوا
پـــــارەدار پـــــارە و پـــــوولی بـــــۆ خـــــۆیتی
کەســـانی کـــەمیش، دەســـت و پـــێن بۆیـــا
کــــەمی هەڵمـــــەگرە، کەســـــیەتیت بگـــــرە
زەنگینـــــی لمـــــوز بـــــەرز، بـــــا بــــڕوا
ڕێـــــزداران دیـــــارن، نموونـــــە کـــــەمن
پیـــاوی پەســـــندی بـــــەم شــــێوە کـــــوا؟
زەنگـــین نـــازی چـــی ئەکـــەی بەســـەرما!
کـــە خۆپەرســـت بـــێ، لێـــی نەکـــەی شـــەرما
منـــیش پێـــت ئـــەڵێم بەچـــت دانـــانێم
بەباربـــــەری خـــــۆم، دام نـــــای بەکـــــەرما
ئـــــەوەی کەهـــــــەیتی زۆری بوغرایـــــــە
هـــەموو کـــەراش خـــوار جێـــی لەســـەر ســـەرما
پیاوبـــــە ئـــــەی هـــــەبو، بـــــەهیچ مـــــەنازە
ڕووخـــۆش بـــی، گشـــت کـــەس ئـــەڵێ هاوەڵمـــا

هەولێر
٢٠١٧/٨/٥

## خەو

ســـوپاس بـــۆ (خـــودا) کـــەدای نـــاوە خـــەو
تـــا ئاســـوودە بـــین، کاتـــێ کـــەدێ شـــەو
خـــەو نەکـــەی گیانـــت لـــەکار ئەکـــەوێ
خـــەو ئـــەتپارێزێ پـــێی بـــدە بـــرەو
ئـــەتۆش خـــەو بەهەدیـــەك لـــەلای (خـــودا)
- بزانـــــە تـــــاکو ببـــــی بەپێشـــــڕەو
کەواتـــە هـــەردەم قـــەرزاری (خـــودایــن)
ئـــەبێ کوڕنـــوش بـــەین بەتـــەنیا بـــۆ (ئـــەو)
قـــەرزی (خـــوا) بەئێمـــە نادرێتـــەوە
شایســـتەی (ســـجدە) هەرخوایـــە هـــەر (ئـــەو)

هەولێر
٢٠١٧/٨/٩

## قەرز

کـــەس هەیـــە بـــۆ قـــەرز دەســـتت مـــاچ ئـــەکا
خـــودی خۆشـــی بـــۆت، بـــەقوربان ئـــەکا
بـــەڵام کەویســـتت، بڵێـــی بمـــدەوە
ئـــەبێ خـــاوەن قـــەرز، قاچـــی مـــاچ بکـــا

هەولێر
٢٠١٧/٨/١١

## ناکەس

کاری باش ناکەس پێ نەزانتەوە
تا بکرێ لەدالْغەت ئەداتەوە
پاش ئەنجامدانی کاری باش وردبە
بزانێ زوو ساردت ئەکاتەوە
ناکەس کەسیش بێ، دای مەنێ بەکەس
پێی بکرێ بێ هۆ ئەتشواتەوە
بەڵام بت بینێ، لەخۆشیدابی
ئەمرێ بەدڵەی، پەستو ماتەوە
کەواتە رازت قایم و توند بێ
لەکارت تا ساردت نەکاتەوە
یا(خوا) نموونەی ناکەسان نەکاتەوە
تا بەغەم هەر خەو بیانباتەوە
ژیانت خۆش بێو، کیانت باش بێ
تێتبگا، ئەڵێی دیسان هاتەوە
بواری پێمەدە، با پێت نەزانێ
بەشکە بەغەما، خەو ئەیباتەوە
بەچکەی ناکەسیش، ئەبێ ناکەس بێ
بەرهەم وەکو خۆی، ڕەنگ ئەداتەوە
لەکۆتا چارە، خۆت بپارێزە
لەدڵی پیس و پەستو ماتەوە

هەولێر
٢٠١٧/٨/١١

# خۆشی و تاڵی

تاڵی تا ئەڕوا، گەلێ زۆر تاڵە
سیستەمی (خوداش) بەسەریا زاڵە
خۆشیت تا ئەڕوا، گەلێ زۆرخۆشە
هەست پێ نەکەریش زۆر بێهۆشە
ماندوو نەناس بە، لەپێناو خۆشی
ڕای (خوای) لەسەربێ، تۆ هەر ئەینۆشی
لانەدەین (خوایە)، بەدیتنی خۆمان
پێ گومڕا نەبین، بەلاڕێی ژیان
چیمە لەمڕێگەی، کە پێی مەست ئەبم
سەرقاڵی بەد بم، بێ مەبەست ئەبم
(خوایە) بەس (تۆم) هەی، تاکی پەنام دەی
سەربەرز و ساغبم وەبەتوانام کەی
ئاشووبو ئاژاوەم، لەسەر لادەی
باڵی سۆزی (خۆت)، زەییت پیام دەی
دڵگەشی ڕاستی و ڕێگەی ڕەوام کەی
بەتوانا و هێزت، دڵم گوشاد کەی
(خوا)مانی هەرچی، لای (تۆ) بۆمان بێ
هیچ هێزێ نیە، بەرپەرچی کا لێ
هەست بەهێزی (خوا) نەکەی بێهۆشی
لەپاشی تەنگی، ئەکەویە خۆشی
(خوا) بیوێ پاشی تەنگی خۆشی دێ
گەشبین بە گەشبین خۆشی لەبۆ دێ
خۆشیت ئەگاتێ خۆشی بەدڵ خۆ
(خوا) لەیاد مەکە، ناتکا ڕەنجەڕۆ

هەولێر

٢٠١٧/٨/١١

## کەسێکی بۆی هات

کەسێکی بۆی هات، مەڵێ دەرناچێ
شەنسدارە مەڵێ، خۆ بەچ ناچێ

وایە هەربۆیە لێمبەرکدا چێ
ئەیەوێ دەرزی بەدەستەم داچێ

بەڵام لەسەر وەش زامدارە دەستم
دەرزیەکەی ئەگرم لێی ئەکەم ماچێ

هەولێر
٢٠١٧/١١/٥

## مصائب القوم عند القوم فوائد
## نەگبەتی هۆزێ

نەگبەتی هۆزێ، بۆ هیتر سوودە
یەك نەگبەت ئەی گرێ و، یەکپێ ئاسوودە
لەسەر ئەرکی کەس، خۆت مەخە خۆشی
تاوان... با... شانت نەگرێ بێ هوودە

هەولێر
٢٠١٧/٨/٢٠

## خەزنە

بزانـــــى خەزنـــــە، كەچـــــى لـــــەناوە
نـــــەك بەچـــاو، بێچـــاو ناكەوتـــــە داوە
بچـــيە نـــاو داوە، وەك سووســـكە ئـــەتگرێ
سوپاســـى (خـــوا) كـــەين، كـــە هۆشـــيداوە
بـــــەڵام بيســـــتوومە كۆرشـــــەق ئـــــەهاوێ
بـــــۆ وايـــــە؟ چـــــونكە نابينـــــا و خـــــاوە
بـــەڵام چـــاو نـــەما، بـــير بـــەهێز ئـــەبێ
هێـــزى بـــير زۆرە، بـــەس چـــاو لـــەباوە
چـــەند چـــاو لـــەباوە ســـەنگى خەزنەكـــەى
ئـــــەبێ بزانـــــێ، (خـــــودا) پـــــێى داوە
كـــاريش كـــارێ بـــێ، هـــى (پـــەروەردگار)
هـــــەرگيزا و هـــــەرگيز جێـــــى لەسەرچـــاوە
بزانـــــە ســـــەنگى زێـــــڕ لاى زێڕينگـــــەر
هـــــەموو دەم ديـــــارە، لـــــەبۆى لـــــەباوە
هـــــۆش پـــــێ دراويـــــش، گۆزەبانەيـــــە
كـــــەپێيا دراوە، لـــــەلاى (خـــــوداوە)
ئـــەم جيهانـــە هـــەر وا هـــاتوە و ئـــەڕوا
ڕازى تـــەواويش، بـــەس لاى (خـــوا) مـــاوە
تـــا بـــەدواى كـــەوى تـــۆ ناگـــەى بـــەهيچ
(خـــــودا) ڕازى (خـــــۆى) بەكەســـــنەداوە

هەولێر

٢٠١٧/٨/٢١

# هەیە ساکارە

هەیـــە نـــاز هـــەڵگر، بـــۆت دێتـــە ڕایـــە
نـــازت هەڵئـــەگرێ، لای چـــی تیایـــە
لەدوایـــــە، تـــــۆی لێ ئـــــەبێ بـــــەبارێ
کـــەزۆر قورســـبێ، لـــــەلایا وایـــــە
لـــەلام تاوانـــە، کـــار بـــەهۆش نەکـــەی
پایـــەی بـــیر لـــەلای (خـــوا) و، هۆشمەندایـــە
بـــەڵام ئـــەم کەســـەی، بـــەکاری نـــەینی
لـــەلایا وەکـــو، بەســـەنگ بـــێ وایـــە
دەکـــارزان بـــە تـــۆ، لەئیشـــو کـــارت
تـــاوەکو نـــەڵێی، دڵـــم ڕاڕایـــە
هەربـــژی ئەمـــەی پیـــاوی (خودایـــە)
فـــەرامۆش ناکـــا، کـــار لای بەهایـــە
هـــەموو ڕۆژ دڵـــی خۆشـــە و فـــەرامۆش
خۆشـــی گشـــت گـــەردوون، لـــەدڵیا دایـــە
(یـــا خوا) پـــیرۆز بـــێ، ژینـــی بەختـــەوەر
لـــەوەی هۆشمەنـــدە، تـــا ژینـــی مایـــە

هەولێر
٢٠١٧/٨/٢٣

## لاڤین و ڕانیە

لاڤـــــین خـــــان داوا، وەڕووی كـــــــردەوە
لەشـــــیعری (ســــاڕێژ) بـــــۆ تۆژینـــــەوە
داواشـــــی لێمكـــــرد، كــــەهاوكاریم بــــۆ
تۆژینـــــــــــەوەكی ورد بەهەوڵـــــــــــەوە
ئەخرێتـــــە پـــــێش چـــاوكێ؟ دكتۆرەخـــان
دكتـــــۆرە صـــــافیەی، زۆر بەســـــەنگەوە
پـــاش سەرپەرشـــتی و ئـــەم قـــاو و تۆیـــە
كەوتـــــە بــــــەر باســـــو لێكۆڵینـــــەوە
دیاركـــــەوت لـــــەبۆم ئـــــەنجامێكی بـــاش
لـــەپاش وەی گشـــتیم، تـــەواو خوێنـــدەوە
خوشـــــكانی ڕێـــــزدار (لاڤـــین و ڕانیــــە)
پـــــیرۆز بـــــێ لێتـــــان بەســـــەركەوتنەوە
لـــــەكۆتا ئـــــەنجام، زۆر پـــــێ ئاســـــوودەم
كـــــەئێوە زو گـــــۆی خۆتـــــان بـــــردەوە
بەســـــەركەوتنتان، مـــــن پـــــێ ســـــەركەوتم
بـــــــژین بـــــــەبیر و، هـــــــەوڵی وردەوە
(ســـاڕێژ) ئەیـــــەوێ (ســـاڕێژی) برینـــــی
زامــــدار كـــــا زۆر بەدەســــــت و بــــــردەوە

ئـەم هـۆنراوەی سـەرەوە كەناونیشـانی (لاڤین و رانیەیـە) كەئـەم دوو كیـژە خـەڵكی رانیەنە دانراوە بەبۆنەی (سەركەوتنیان لەلێكۆڵینەوەی هۆنراوەكانی من) لەلایـەن دكتۆرە صافیەوە.

هەولێر
٢٠١٧/٨/٧

## سەیرە

ترسنۆك كێ بێ، هەموو ڕۆژ ئەمرێ
یەكجاری ئازا ئەمرێ بەر ئەگرێ
ترسنۆك تەنگاوبێ یەكسەر ئەگرێ
ورە بەرز هەموو سەكۆیەك ئەبڕێ
بەلاٚم ترسنۆك هەرگیز ئارەقەی
یەك شەرمەزاری، یەك ترس ئەسڕێ
ڕوو قەیەر شەرمی نیە، ڕێ ئەگرێ
بێ منەت پەردەی شەرمیا ئەدرێ
پیاو حەیای هەبێ ڕێی باوەڕ ئەگرێ
شەرمیشی نەبێ، هەڵكەوێ ئەخوڕێ
لەسەر كێ ئەخوڕێ؟ لەسەر بێ ڕووەت
چونكە بێ ڕووەت، هەر بەشی ئەخورێ
بۆ بەشی ئەخورێ؟ بێ دەسەلاٚتە
بێدەسەلاٚتیش شەقی لێئەدرێ
سوپاسی بێ پایان بۆ (خودامان)
بێ ڕووەت نەبوین، هەر بەئەو ئەكرێ

هەولێر

٢٠١٧/٨/٢٥

## كارێ نایزانی

كـــــارێ نــــایزانی خـــــۆتی لێ مـــــەدە
ڕێبەبــــــەدكار و بــــــەدڕەفتار مــــــەدە
تێكـــــەڵ بـــــەكاری بەدڕەوشــــت مەبـــــە
بەدڕەوشـــــت مـــــارە، خــــۆتی لێ مـــــەدە

هەولێر
٢٠١٧/٩/٤

## بەدكار

لای بــــەدكار خێـــــر و شـــــەڕ بەرامبــــەرە
نــــــەزان سوودیشـــــــی لــــــەبۆما زەڕە
گێلـــــەپیاو چـــــاكەش بكــــا بێبــــــەرە
لـــــە(خـــــوا) بـــــەدووریش لامـــــا بەدفـــــەڕە

هەولێر
٢٠١٧/٩/٤

## نەمدیوە

نەمـــــدیوە گشـــــت كـــــەس گـــــوێم لێڕاگــــرێ
هـــــەموو كـــــەس، سەنگیشـــــی پێنـــــادرێ
گـــــوێگر ئەیـــــەوێ ســـــوود لێتـــــوەرگرێ
هـــــــەوڵی بـــــــۆ وەیـــــــە بـــــــەباڵێبفڕێ

هەولێر
٢٠١٧/٩/٢

## ئەسپی چاك

داریٚ بیٚبـــــەر بـــیٚ، زو دیٚتـــــە بـــــڕین
گـــــویٚی لیٚ نـــــاگرن، گـــــەر بیٚتـــــە کـــــڕین
داریٚکـــــی دار بـــیٚ لەبەرهـــــەم گـــــرتن
چـــــاوەدیٚر ئـــــەگریٚتا دیٚتـــــە ڕنـــــین
هـــــەوڵت بـــۆ وەبـــیٚ، ئـــەنجامت بـــاش بـــیٚ
تـــــا لـــــەکۆتادا نیٚینـــــە چـــــاو ســـــڕین
ئەســـپی بـــاش ئالیـــك بـــۆ خـــۆی زیـــاد ئـــەکا
دڵگـــــر و ئازایـــــە لـــــەڕیٚ بـــــڕین
ســـــوارەکەی ســـــەری شـــــانازی ئـــــەکا
ئەســـــپەکەی وەك مـــــەل کەدیٚتـــــە فـــــڕین
هـــــەر قۆشمـــــە ئـــــەکا و بەلەنجـــــە ئـــــەڕوا
نـــــاوی تۆمـــــارە و نایەتـــــە کـــــڕین

هەولیٚر
٢٠١٧/٩/٨

## وریابە نەشکیٚی

بشـــــکیٚی لـــــەپیٚش چـــــاو یەکناگریـــــەوە
ئـــــەبیٚ فرمیٚســـــکی غـــــەم بســـــڕیەوە
لەگـــــەڵ کەســـــی وا تیٚکـــــەڵاو مەبـــــە
کەڕووشـــــکا و تکـــــا لـــــەدەرەوە

هەولیٚر
٢٠١٧/٩/١٧

# میرات گر

زیندوومە دێی میراتم لێئەگری
بۆ بستە خاکێ لەتاوا ئەگری
هەر وەختە ئێستا وەزگەدەی بمری
دەبا ئارەقەی پاشگەزی بسڕی
چیکە چاو لەماڵی خەڵکی نەبڕی
وابی بەجارێ ناویشت ئەزڕی
ئەم خوە فڕێدە هی پیاوان نیە
لەگەرمەی تەریقیا وەختە بمری
کەواتە بیرێ لەژیانت کە
پێش وەی بزەڕی وەکو کەر بتڕی
هەر شوێنێ کەکەر لێیا بطۆپی
سەگ بۆی عەوداڵە و زەوی هەڵئەدڕی
چونکە ئەم کاتە لای سەگ جەژنەیە
لەخۆشی تێربونیا هەردەم ئەخوڕی
ئەڵێن کەر طۆپی بوە جەژنە لای سەگ
سەگ ئەمەکدارە با دوژمن بگری
تەرەی دانراوەی دژ بەخاوەن ماڵ
قاچی گیربێ لێی زەوی ئەدڕی

هەولێر
٢٠١٧/٩/١٥

## کەکارێکت کرد

کەکارێکت کرد هەرچۆنی کرا
کەکۆتایی هات چی کرا کرا
ئەڵێن دۆر درا تەققەشی بڕا
پەند ئەڵێ مانگا مردو و دۆ بڕا
کارێ ئەنجامدە کە کۆتایی هات
با نەڵێن بەسسە ئەی چیت پێ بڕا
قسە هەر چوارە بەس دووی بەکارە
پەیڕەوکەریش جوان پەروەردە کرا
ئاسنی سارد کوتانەوەی بێ سوودە
کەسێکی وابێ لەگەڵدا بڕا
تۆش بەکۆششت ڕاستی بەرمەدە
لەدڵی خۆتو گەل هەڵکە چرا

**هەولێر**
**٢٠١٧/١٠/٥**

## مەرجە بۆ هۆنەر

مەرجـــە بـــۆ هۆنـــەر كەهەســـتیار بـــێ
هەســـتیارێكی وا قســـەی لـــەبار بـــێ
ئـــەم پێناســـەیەت نابـــێ لا تـــاڵ بـــێ
نابـــێ هۆنـــەریش ڕازی لـــەزار بـــێ
پێـــت ئـــەڵێم خـــەڵكت لا مـــام و خـــاڵ بـــێ
هێزیشـــت بەســـەر نـــاڕەوا زاڵ بـــێ
خۆپەســـند نـــەبی دەم بـــەهاواربی
هەرچـــەند بـــی خـــۆت لا بەشـــانوباربی
پـــێ لـــەبیروڕای خـــەڵك هەڵمـــەبڕە
گـــەر دەســـتەڕۆ بـــوی خـــەڵكیش هـــەژاربی
ماســـتاو ســـارد مەكـــە بـــۆ پۆســـتی ژیـــان
- بـــۆ كـــەس تەنانـــەت بەدەســـت و مـــال أبـــی
هۆنـــەران خۆیـــان خۆشەویســـت ئەكـــەن
ئەســـپی ئـــەدەبیان ئەگـــەر بـــەغار بـــی
غـــاردان بەگۆتـــەی وا ڕاســـت و نەســـتەق
نـــەك بەقســـەی رەق دوپشـــكو مـــار بـــی
خـــۆت خۆشەویســـت كـــە لای خـــودا و بەنـــدە
دڵ پـــاش و قســـەت شـــیرین گوفتـــا ربـــی
هـــەر دڵگـــیر ئـــەبی لای هـــەموو كەســـیش
لێبـــوردەو ئـــارامگر بـــە نـــەك تـــاڵ بـــی

هەولێر
٢٠١٧/٩/١٤

## مەرەکەب

ڕازی بـــیر و دڵ لـــــەدەمی خامــــــە
لەنووکەکــــــەیتی لـــــەبۆی وەڵامـــــە
بــــەنووکی نـــــەڵێی مـــــن بەتەمامـــــە
نهێنـــــــی خــــــۆتم پێــــــدەی بەنامـــــە
مەرەکـــــەب خــــواردنی خامەیــــە و لامـــــە
نووکەکــــــەی وەك دەو لێ ی ئــــــەکا تامـــــە
دەنگوبــــــاس گـــــوتی لـــــەخۆراك دامـــــە
مەرەکـــــــەب خۆراکـــــــەوە ئەنجامـــــــە
کەواتــــە زانـــــیم نـــــووك مەســــتە پێیـــــا
پاشـــــم جێگرمــــــە کــــــەبۆم توانامـــــە
(ســــــاڕێژ) تواناکــــــەم (ســــــاڕێژی) زامـــــە
هەســـــتم دەرئــــەبڕم پێـــــی تــــاکو مامـــــە

هەولێر
٢٠١٧/٩/١٧

## ئمڕۆ

بــــۆ بەدڕەوشـــــتان ڕوتیـــــو ســـــفووری
لەگــــەڵ چـــاوبازی بــــوە کەلــــەپووری
گــــەورە بــــەڕێز بــــێ گچــــکە ئــــەبورێ
هــــــەنگاو مــــــەهاوێ بڕوانــــــە دووری

هەولێر
٢٠١٧/١٠/٨

# ماڵی دونیا

کــۆر بەســـەر خەزنـــە ئـــەڕوا و شـــەق داوێ
چـــونکە نازانـــێ چـــی تیـــا لـــەناوێ
خۆشەویســـتی مـــاڵ لـــەماوەی ژیـــان
وای لێ هـــات بۆیـــا، خـــۆت خەیتـــە داوێ
بـــەڵام لای هـــەموو کەســـیش وانیـــە
کەســـیەتی و ســـەری بـــەرزت وای نـــاوێ
لـــەکۆتا (ســـاڕێژ) ئـــەڵێ گـــوێ بگـــرە
بـــۆ پـــوولی بـــەرکت بـــەرد بـــۆ کـــەس مـــاوێ
مـــاڵ بـــەهادار و پـــیرۆزە ئەگـــەر
دەســـتکەوتی رەنـــج بـــێ بـــۆ پـــیر یـــا لاوێ
هەیـــە بەهـــەوڵی کـــەم مانـــدوو ئـــەبێ
کەبـــەرد بـــۆ نیشـــانەکەی ئـــەهاوێ
هەشـــە ناوەســـتێ و هـــەردەم غـــار ئـــەدا
نانیشـــی ســـوارە ئـــیتر پـــێی نـــاوێ
داوای تایبـــەتی لـــە(خـــوای) مـــەزن کـــە
کاتـــێ لـــەبۆیا کەئەچـــیە ڕاوێ
ڕاوی چـــی؟ ڕاوت هەوڵـــە بـــۆ ماڵـــت
تـــاوێ دانیشـــتی و، لەهـــەوڵی تـــاوێ
ســـەرفرازی ژیـــن، تـــا بڵـــێی خۆشـــە
بەرەکـــەت، دەربێنـــە لـــەناو ئـــاوێ
ماندوونـــەناس بـــە، هـــەروەکو هـــەنگ بـــە
تـــامی کەرکەشـــان، جیایـــە لـــەڕ اوێ

ڕاوی هـــــەنگوینیش تـــــاموبۆی هەیـــــە
بـــۆ کەســـێ پـــارووی ئەکەوتـــە نـــاوێ
بەهـــــەوڵ و کۆشـــــش ئـــــەم ڕاوە دەردێ
نـــــەك بەلاســـــاری و لەشـــێکی خـــاوێ
کۆشـــش کـــە و (خـــوداش) بەپشـــت بزانـــە
کەســـــــیەتیت بـــــەرزە وەك پـــــارێزراوێ

هەولێر

٢٠١٧/١٠/٩

## گەورەی ناشایست

گـــــەورەك داریێ بـــێ دارێکـــــی بـــــەری
لەچـــــڕی داهاتبـــــێ لـــــق و بـــــەری
کەکـــەس لێ ی نـــەخوا یـــا نـــەی بـــێ زەڕی!
کەسووکاریشـــــی لێـــــی بـــــێ بێبـــــەری
یـــاخوا ئـــەم گـــەورە زۆر زو هـــەڵوەری
گـــەورەی تونـــدی جـــیر تـــۆ داری تـــەڕی
خۆشـــــت پـــێ زانایـــــە! نـــا.. وەك مـــــەڕی
دەپــــــــێم ببێـــــــژە بـــــــۆ بەگێچـــــــەڵی؟
کەسووکاریشـــــت پێـــــت ئـــــەڵێ کـــــەری
یـــاخوا ئـــەم گـــەورە زۆر زو هـــەڵوەری
گـــەورەی هـــۆش بچـــووك وەك کـــەر ئـــەزەڕی
کەبـــــەربوە زەڕیـــــن وەك ســـــەگ ئـــــەوەڕی
بـــۆ لەئاســـــت ڕەســـــەن ئامـــــادەی شـــــەڕی

بەرامبـــــــەر بـــــــەڕێز وەك لەناوبـــــــەری
یــاخوا ئــەم گــەورە زۆر زو هــەڵوەری
گــــەورەی ئاســـت بچـــووك نـــەكا.. ڕەچـــاوی
بـــاری بچـــووك و.. چـــۆنی.. تـــا مـــاوی
بەرامبـــەر بچـــووك.. بچـــووك بـــێ چـــاوی
دڵـــی خـــۆش نـــەكرد نـــەیگوت لـــەباوی
یــاخوا ئــەم گــەورە زۆر زو هــەڵوەری
گـــەورە بـــۆ بچـــووك وەكـــو پشـــت نـــەبی
بـــەكردەوەی بـــاش لـــەبۆی پشـــت نـــەبی
دەســـتڕۆش بـــی وەبـــرا گـــەورەی گشـــت نـــەبی
لـــەپێناو ڕەوا گیـــان بەكوشـــت نـــەبی
یــاخوا ئــەم گــەورە زۆر زو هــەڵوەری
گـــەورەك لـــەتوانای بـــێ چـــاكە بكـــا
بـــــەڵام نەیـــــەوێ ڕۆژێ وا بكـــــا
ئارەقـــــەی شـــــەرمی دیـــــارە لێتكـــــا
بۆیـــــە وا دەرچـــــو دووربـــــە لێ ی تكـــــا
یــاخوا ئــەم گــەورە زۆر زو هــەڵوەری
گـــــەورەكی وەهـــــا كەســـــەنگین نـــــەبی
بـــــۆ بچـــــووك زمـــــانی شـــــیرین نـــــەبێ
پەیڕەوكـــــەرەوەی یاســـــای ژیـــــن نـــــەبێ
ڕێـــــزی بچـــــووكی لـــــەدڵ شـــــین نـــــەبێ
یــاخوا ئــەم گــەورە زۆر زو هــەڵوەری
گـــەورەك بـــۆ بچـــووك وەكـــو پیـــاو نـــەبێ
لـــەبۆ بـــەدكاری هـــەرگیز خـــاو نـــەبێ

سەنگی بچووکی لەلا باو نەبێ
رابەری چاکەی لا تاو نەبێ
یاخوا ئەم گەورە زۆر زوو هەڵوەری
گەورەك خاكەكەی لا شیرین نەبی
خۆشنوودەی هەژار و زەنگین نەبی
پەیڕەوی دەستوور وەئایین نەبی
نازی میللەتی لەدڵ شین نەبی
یاخوا ئەم گەورە زۆر زو هەڵوەری
گەورەیەك قسەی خۆی بخواتەوە
بەرژەوەندی خۆی پێش گەل خاتەوە
میللەتەكەی خۆی لەبیر باتەوە
بەرهەمی خاكی گشت بخواتەوە
یاخوا ئەم گەورە زۆر زو هەڵوەری
گەورەك میللەت و خاكی بفرۆشێ
هەموو بەرهەمی گشتی بنۆشێ
كورسیەكەی بگرێ و بۆی تێبكۆشی
چاو لەگەندەڵی و دزی بپۆشێ
یاخوا ئەم گەورە زۆر زو هەڵوەری
گەورەك هەر ڕۆژە قسەیەك بكا
دووڕوو و برسی بێ لەلاما شكا
ئارەقەی شەرمی پێش چاوم تكا
تاجێ لەق نەبێ چێڕ بێ لەڕكا
یاخوا ئەم گەورە زۆر زو هەڵوەری
هەولێر- ٢٠١٧/٩/٢٥

## دزی ڕووكراوە

تــا مــاڵخۆ دزی گــرت، دز مــاڵخۆی گــرت
تـا كـەر چـوە بـەر بـار، بـار هـات كـەری گـرت
پەشــێوی شــكاوەی دەســت بچــووك مــرد
ناكەســـی تەنگـــە، بـــوە پـــارو بـــەخورت
ناكەســـیش شـــایان پایـــە و ڕێـــز نیـــە
بـــا پـــاروی ولاغ بـــیٚو زمانیشـــی كـــورت

هەولێر
١٣-٢٠١٧/١٠/١٤

## دڵ ئاوێنەی دڵە

چـــیبكەی كاردانـــەوەی خـــۆی هەیـــە
كەوتنــە بــەر دڵــیش شــوێنی خــۆی هەیــە
كەســـێ كەســـێكی تـــری خۆشـــبوێ
دیـــارە ئـــەویتر كـــەوا تـــۆی ئـــەوێ
بیســـــتوومە دڵـــیش نەینۆكـــە بـــۆ دڵ
دڕك بــێ دڕكــە، گــوڵیش بــێ بــۆی گــوڵ
بـــێ كـــەمووكوڕی وەكـــو شـــێوەی خـــۆت
نیشـــانت ئـــەدا ئـــەوا بـــار بـــەمل
بــۆ دڵســۆز هــەردەم دڵســۆز و دۆســت بــە
لـــەبۆ نـــەیاریش مـــاوێ بـــەردی زل
تـــا ناحـــەز هۆشـــی دێتـــەوە ســـەر خـــۆی
هـــەر چـــاكەكار بـــە بـــا نـــەبێ دڵ كـــول
كـــەتۆ ڕێی راســـتت نیشـــان یـــەكێ دا
دێتـــەوە ســـەر ڕێ نـــەك بـــێ دەســـت و پـــل

هەولێر
٢٠١٧/١٠/١٥

## دۆستی کۆن

دۆســـتی کـــۆن هـــیچ کـات نابـــێ بـــەدوژمن
نموونــــە زۆربـــن، بـــۆ خـــەڵك و بـــۆ مـــن
چـــەند دۆســـــتم هـــــەبێ، لـــــەلاما کەمــــە
دوژمنێـــــك لـــــەبۆم، جێـــــی داخ و غەمــــە
دۆســـــتیش نـــاوی خـــۆی بـــەخۆوە دیـــارە
ناگۆڕدرێتــــــــەوە، بــــــــەزێڕ و پــــــــارە
بـــــەلام بـــــەم مەرجـــــەی راســـــتەقینەبێ
نـــــەك کـــــوڕی رۆژ بـــێ، بـــۆت بەقینــــەبێ

هەولێر

٢٠١٥/١٢/٢٠

## بەر پێت ببینە

بـــــەر پێـــــت ببینــــە و هـــــەنگاو بهـــــاوێ
ئەکەویـــــە چـــــاڵێ، نــــــەبینی چـــــاوێ
بـــــێ لێکدانـــــەوە هـــــیچ کـــــارێ مەکـــــە
دەنــــــا وەك سووســــــکە ئەکەویـــــــە داوێ
ئــــــەم ئامۆژگاریـــــەش، لـــــەبۆ کەســـــێکە
بـــــێ شـــــیکردنەوە بچـــــی پـــــێ بـــــاوێ
هەرکـــەس قســـەی کـــەس لەگوێچـــکە نـــەگرێ
لەخۆباییــــــە، هەنــــــدەی پـــــێ نـــــاوێ
چـــەندی هۆشمەنـــد بـــی لـــەتۆ هۆشمەنـــدتر
هەیـــــە هـــــەمووەم پـــــیر بـــــی یـــــا لاوێ
(ســـاڕێژ) پێـــت ئـــەڵێ قوڕســـو گـــران بـــە
تـــا خـــۆت ڕێـــك نەخـــەی نـــاوێی شـــەقاوێ

هەولێر

٢٠١٨/١٢/٩

## چێژی غەم

مەستی غەم هەڵچوو خەیاڵی، کاریکردە دڵ بەتیر
کاتێ دڵچێژی غەمی کرد کاری کردە سۆزی بیر
هەرکەسێ هەستی نەبێ گێلە گەدابێ یاخو میر
کاری غەم خولیا ئەدا پێت، گەنجی چی! پێئەبیە پیر
غەم کەپەنگاوە وەزۆر بو ناخی بیری کرد ئەسیر
کاتێ ناخی بیر ئەسیر بو، ئەشکی سەر ڕووی کردە لیر

هەولێر
٢٠١٨/٤/١٦

## تلقین بەشێوەی هۆنراوە

سوپاسی گەورە و بێ پایان لەبۆ
(خودای باڵا دەست) وەمولکی وە (خۆ)
هەر (الله) ئەمینێ بەتەنیایی
هەمووشت لەناو ئەچێ ئاسایی
ئەگەڕێینەوە (لای) لەکۆتایی
بۆ حەشر و حیساب لەڕۆژی دوایی
سەلامی (خودات) لێ بێ بەندەی (خوا)
ڕۆڵەی بەندەی خوا پێت ئەڵێم ئێستا
هاتیە دەر لەناو دونیای بێ بەها
گەییتە ماڵی هەمیشەیی تا
لەماڵی ناخۆشیو ناهەمواری
نەمایو هاتیە ماڵی یەکجاری
ماڵەکەی دونیات کۆتایی پێ هات

دەرچــــویو نــــەمای وا لێــــی بــــوی نجــــات
بێتــــــەوە یــــــادت ئــــــەم بەڵێنــــــەی وا
کەئــــــەژیای لــــــەدونیای زۆر بــــــێ بــــــەها
لــــــەزار پێغەمبــــــەر کەبەنــــــدەی (خوایــــــە)
ئاگــــــادار کرایــــــی (خــــــودا) تەنیایــــــە
ئێســــــتا دوو فریشــــــتە دێنبــــــۆ لات چــــــاکن
مەترســــــێ و دڵگــــــیر مەبــــــە زۆر پــــــاکن
دوو فریشــــــتەی بەنــــــدەی نێــــــرراوی (خوانــــــە)
دێــــــن بــــــۆ لات کــــــەوا ئــــــەم پرســــــیارانە
ئاراســــــتە کــــــەن بــــــۆت پێــــــت بڵــــــێن ئایــــــە؟
(خــــــودای تــــــۆ) کێیــــــە بڵــــــێ (الله)یــــــە
لەدوایــــــە ئــــــەڵێن کــــــێ پێغەمبەرتــــــە؟
محمــــــد ســــــەروەرمە، وەســــــەروەرتە
دانبنــــــێ (محمــــــد) پێغەمبــــــەرە
لــــــەدین و دونیــــــا ڕێ پیشــــــاندەرە
لەدوایــــــە ئــــــەڵێن ئایینــــــت چــــــیە؟
لــــــەوەڵام بڵــــــێ ئیســــــلامەتی یــــــە
کــــــەگوتیان قیبلــــــەی تــــــۆ کێنــــــدەر بــــــوە؟
بڵــــــێ قیبلــــــەی مــــــن هــــــەر کعبــــــە بــــــوە
کــــــەپێیان گــــــوتی کێخوشــــــکو براتــــــە؟
بــــــەوردی وەڵام دەوە ئــــــەم کاتــــــە
بڵــــــێ بــــــاوەڕدار لــــــەژنو لــــــەپیاو
خوشــــــکو بــــــرامن وەك گلێنــــــەی چــــــاو
ئێســــــتا ئامــــــادەبوان و نــــــەهاتوان

ئەمانـــــــەی ئـــــــەیڵێم بـــــــزانن ڕەوان
مـــــــردن و قـــــــەبر دوانـــــــن لەمانـــــــە
پرســـــیار و فریشـــــتە، ڕاســـــتن ڕەوانـــــە
زیندوبوونـــــەوە و حەشـــــر و تـــــەرازو
گشـــــتی ڕەوایـــــە و، لـــــەبۆم ڕەوابـــــو
ئـــــاگری دۆزەخ صـــــراط لەگـــــەڵیا
ڕەوانـــــە لامـــــان زۆر بـــــەدڵنیا
کافرەکـــــان ئـــــەیان وێ گـــــومڕات بکـــــەن
بانگەشـــــەی بـــــەدرۆی وا ئـــــەنجام ئـــــەدەن
بـــــەدرۆ پێـــــت ئـــــەڵێن زینـــــدوو نابیـــــەوە
ویســـــتیان گومڕابوونتـــــە بـــــەم هەڵـــــەوە
مســـــۆگەر راســـــتە زیندووبوونـــــەوەت
لێپێچـــــینەوەش لەســـــەر کـــــردەوەت
لـــــەلای (خـــــوای گـــــەورە) گشـــــتی ئاســـــانن
زەخیرەکانـــــت، هـــــەوڵی جیهـــــانن
ئەیبەنـــــدە، جەســـــتەت دروســـــتبوی خاکـــــە
ئەبیتـــــەوە خـــــاك بـــــەم خوایـــــە تاکـــــە
لەدوایـــــە لـــــەخاك دێیتـــــە دەرەوە
بـــــۆ حەشـــــر و حیســـــاب، هۆشـــــیار بـــــەرەوە
(خوایـــــە) بەنـــــدەی ژێـــــر خـــــاك پارێزراوکـــــەی
(خوایـــــە) زمـــــانی، ڕاســـــت و پاراوکـــــەی

**ئامادەبوان:**

**(خوای گەورە) فەرموویەتی (کل من علیها فان ویبقی وجه ربك ذو الجلال والاكرام) (واتە هەموومان ئەبێ تاڵاوی مەرگ بچێژین و بەتەنیا هەر خودا ئەمینێتەوە) ئەم گۆڕە ماڵی کۆتاییمانە کەواتە پێویستە لەسەرمان زەخیرەی ڕۆژی دوایی دابنێین و لەفەرمانی خوا نەچینەدەرەوە و زمانو کردەوەمان یەك بێو پەند لەمە وەرگرین.**

**لەکۆتایی دا:**

**رێز و گەورەیی (سورەی فاتحە) بخوێنن لەبۆ ئەم مردوە تکا**

**هەولێر**

**٢٠١٨/٤/٩ز- دووشەممە**

## قەشەنگی

**لامجوانە جوانێ لەلاما جوانبێ**
**ئەبێ قەشەنگی خۆراکی گیانبێ**
**خۆ ئەگەر جوانی لەبەر دڵان بێ**
**لامو لەلاتان ئەبێ دەرمان بێ**
**هۆی ئەمەش هەردەم لەپەرەسانە**
**دڵنیام کار جوان تەنیا (یەزدانە)**
**کەسێ دان نەنێ، پێی لەگومانە**
**گومڕایە تووشی دەرد و تاوانە**
**گومڕای (خوا) کاری ئاسانی گرانە**
**لەزەبوونیدا ژینی نەمانە**
**هەردەم و ساتێ هەر پەرێشان بێ**
**ئێستا و دواڕۆژیشی هەر نەمان بێ**

**هەولێر**

**٢٠١٧/١١/٥**

## دوانی کەسێ

لەکاتێ کەوا کەسێ ئەدوێنی
غیرەتی هەبێ خۆی ناڕوخێنی
چونکە هەر کەموکوڕیەکی هەی بێ
کەسی بەرامبەر دای نامرکێنی
پیاو هەرگیز ورەی خۆی نامرێنی
کەسیش بەتیر و توانج ناشکێنی
لەکاتێ کەسێ قسەت بۆ ئەکا
گوێ ئەگری تا.. کۆتا بەقسە دێنی
پەیڕەوکەر لەبۆ گشت ئەم قسانە
دڵنیام زۆر کەس ئەکەوتە شوێنی
چونکە هەر چیت چاند، ئەیدوریەوە
دێتەوە ڕێتا، ئەمەی ئەیچێنی
تۆش گوڵ بنێژە، تا گوڵ بدروی
تۆ گوڵ بدە خاک، گوڵ سەر دەردێنی
لە ڕێی خۆت بڕۆ با هەڵ نەدێرێی
تا دەستو مستی خۆت باش ببینی
بزانە کەماڵ بەمالخۆ ئەچێ
باوکت ڕەسەن بێ، ئەچی بەشوێنی
مەرج نیە ڕۆڵەش لاسای باوکی کا
کەواتە لەبۆ تۆ چی ئەهێنی؟
پیاو بەو ڕێی پیاوان بەرمەدە و ڕاستبە
کەباوکت بەد بێ، وابێ چی دێنی؟

گیـا لەسـەر پنجـی خـۆی ئـەڕوێ و ئـەڕوا
هەوڵـــدە بـــاش بـــی، دڵان نەشـــکێنی
ڕووت لەئاوێنـــەش کـــەی خـــۆت ئـــەبینی
بـــای بێـــداری بـــەر، گـــوڵ ئـــەوەرێنی

هەولێر
٢٠١٧/١١/٢

## مۆم خۆی بەخت کرد

مـــۆم خـــۆی بـــەخت کـــرد کەبتوێتـــەوە
بـــــەم توانـــــەوەش، بگەشـــــێتەوە
پـــــاش گەشـــــانەوە، ئەڕازێتـــــەوە
کـــــەجوان ڕازاوە بـــــەزەوق دێتـــــەوە
بەڕازانـــــەوە بـــــەخۆ دێتـــــەوە
لەدوایـــــە ئاســـــوودە ئەبێتـــــەوە
مووشـــــەخۆر نـــــەبێ دڵ ئەکرێتـــــەوە
لەدوایـــــە گـــــەڵیش ئەحەســـــێتەوە
مـــۆم بـــو بـــەڕێزدار لای (خـــودا) و بەنـــدە
هەرچـــی چـــاندبێی لـــەبۆت دێتـــەوە

هەولێر
٢٠١٧/١١/٣

## نەزان

هەر ڕۆژێ نەزان بۆ سمێڵ بچێ
بزانە ڕیشی زو لەدەست ئەچێ
بۆ وەهای لێدێ کاری بەڕێ و جێ
ناکات و نایکات کاری لەسەر ڕێ
کەسوودی بۆ خۆی نەبێ ئەی بۆ کێ!
نەزان یەکەم جار دوژمنی خۆیتی
هەر کەتێکەوتیش، شین و ڕۆڕۆیتی
کەواتە منیش، گازاندام نیە
زیانی زۆری گشتی بۆ خۆیتی
کەسوودی بۆ خۆی نەبێ ئەی بۆ کێ!
نازی کەرە پیاو هەر ڕاناگیرێ
خۆت ماندوو مەکە و، مەکە تەگبیرێ
سوودیشی زەڕە و بۆی ماوێ تیرێ
چەند تەختەی کەمە، هەر لێ ی ناگیرێ
کەسوودی بۆ خۆی نەبێ ئەی بۆ کێ!

هەولێر
٢٠١٧/١٠/١٦

## خۆت پێ فیله

تـــا نەچـــوویە شـــەڕ خـــۆت لـــەلا فیلـــە
ئـــەبینم خـــودی تـــۆش، لەشـــەڕ دیلـــە
بـــۆ وەهـــای؟ کـــار و قســـەت لێکـــدوورە
ئـــەنجام شـــەپڕێویت، لـــەگێلی بـــیرە

هەولێر
٢٠١٧/١٠/١٦

## بڕوانە

پیـــاوی چـــاك لـــەبۆت ســـوود ئەداتـــەوە
هـــەر گـــردە کەنـــدێ پـــڕ ئەکاتـــەوە
برینـــێ کـــەپیس بـــو خـــۆی ئەخواتـــەوە
زمـــان درێـــژ هـــەموو کـــەس ئەشـــواتەوە
جەســـووریش گـــۆی خـــۆی هـــەر ئەباتـــەوە
لەهەڵوێســـــــتیدا ڕەنـــــگ ئەداتـــــەوە
وەفـــادار هـــــەر دڵ گـــــەش ئەکاتـــــەوە
خـــۆی لـــەپێش چـــاوان بـــەرز ئەکاتـــەوە
ترســـــنۆك لەشـــــەڕ زو ئەڕواتـــــەوە
لـــووت بـــەرز لـــوتی بـــەرز ئەکاتـــەوە
چـــاکەی خۆپەرســـت ســـود ناداتـــەوە
بەمـــــەش لـــــەڕێزی کـــــەم ئەکاتـــــەوە
زمـــانی (ســـاڕێژ) پـــەنگ ئەداتـــەوە
لەچـــاکەش نزیکـــــت ئەکاتـــــەوە

هەولێر
٢٠١٧/١١/٣٠

## هەرچەندی بژی

چـــەند بـــژی ژینـــت کۆتـــایی پـــێ دێ
هەرچـــــی بچـــێنی ئـــەوەت دێتـــەڕێ
ڕێـــزدار بـــە بـــەڵام مەبـــە دەســـت و پـــێ
کـــەدوای... بـــدوێ بـــەس بـــەڕێووچێ
ڕێـــزی بەتەمەنـــدار بگـــرە.. پـــێ بـــەپێ
دڵســـــۆز بـــــە وەڵام بـــــدەوە.. بـــــەڵێ
چـــاو نـــوی مەکـــە لـــەبۆ هـــیچ کەســـێ
بـــۆ پیـــاوی ڕەســـەن ببـــە بەکەســـێ

هەولێر
٢٠١٧/١٢/٢٣-٢٢

## پشووی لەبار

لەپشـــووی لـــەبار نەکـــەی بـــاز بـــدەی
هەســـتت برینـــدار کـــرا بەرپەرچـــی بـــدەی
نـــەك دوایـــە بڵێـــی لـــەجێی ئـــەم قســـە
دەبـــا وام وتبـــا.. بـــۆ خـــۆت مـــات ئەکـــەی؟

هەولێر
٢٠١٧/١٢/٢٣

## قسە

قســـــان بـــۆ خـــەڵکی ناڕەســـەن مەکـــــە
ڕازی دڵ بــــــەهیچ کەســـــێکا مـــــــەدە
ناپەســــــند ڕازی دڵتــــــی کەوتــــــە لا
لەڕووتیئـــــەدا، چـــــونکە خـــــۆی بـــــەدە

هەولێر
٢٠١٧/١٢/٢٣

## کار

کەسێ کار لەپێش چاو خەڵك ئەخا
نامەردە، سووکە، بۆیە وائەکا
حەسوودە، وە خۆپەرستە، تکا
نامۆ و، چاوشۆڕە، با هەر وابکا

هەولێر
٢٠١٧/١٢/٢٣

## پاکی و خاوێنی

دڵنیام ڕاستە ئەوە بار بەمل
چەپەڵ ناڕێکە و ناکەوتە بەر دڵ
خاوێنی هەردەم بەڵگەی باوەڕە
دروشمی بەرز و جوانە وەکو گوڵ
دەتۆش بایەخ دە بەپاکی ڕۆڵە
لەقسەم ورد بە، نەك بەقسەی زل
هەرچی لەپیسی ڕەنگ بداتەوە
پیوەری دڵە مەبە چەل و مل
لەسەر خاوێنی وەپاکی ڕشت بە
وەك مەل گورج بە، لەم چڵ و ئەم چل

هەولێر
٢٠١٨/٢/١

## تەمەن

تەمـــــەن مــــاوەکی دیــــارکراوە لــــەبۆت
ماوەکــەی چــەندە؟ دیــارە لای (خــوای) خــۆت
جگـــە لــــە(خـــــودا)، کـــەس پێنازانـــێ
مــــەرد چـــاکەکارە تــــاکو بتوانـــێ
وەکـــــو دارێکـــــە نەشـــــو نمــــا کـــا
بــــەر بــــدا لــــەپاش ئــــەوەی خــــۆی چــــاکا
ســــەرەتا جــــوان و ڕازاوە و گــــەش بــــێ
بــۆ ئــارەزووی خــۆی تــا لــەباوەش بــێ
کەگــــەش بـــێ مەســـتە رازاوە و جوانـــە
بــــۆی ســـــەرەتایە و خۆشـــــی ژیانـــە
بـــەهاری تەمــــەن جوانــــە هـــــەموو دەم
بڵـــێم کــــوا؟ ئـــەڵێ لـــــەناو ئاوێنـــەم
خـــوا وەبکــــا مــــاوەی تەمــــەن ببینـــێ
پـــێش وەی زســـتانی بــــۆ بـــێ لــــەژینێ
لـــەکۆتا گـــوڵی تەمــــەن ســـیس ئـــەبێ
پـێش چـاوی ناکـەس سسـت و پـیس ئـەبێ
لـــەلای خانـــەدان تەمـــــەن بەسەرچـــێ
نـــەلێی لـــە ڕێـــزو پایـــە دەرئـــەی چـــێ
تــــا مـــاوە بەســــەر تەمـــەن بـــڕواتن
سوپاســـــی خـــــودای گــــەورە ئـــــەکاتن
بەمـــەش لــــەلای خـــوا ئـــەبێ بـــەڕێزدار
کــــەکوڕنوش ئــــەبا بــــۆ (پــــەروەردگار)

ڕێزدار بی ڕێزدار ئەبی لای ڕێزدار
ڕێزداری تەواو بەزار و کردار
بەتەنیا (خوایە) لەهەموو گەردوون
تۆش پەرستیار بە و بڕۆ بەدوو شون
ئەم ڕێیە، تا (خوا) سەربەرزت بکا
دەتۆ یەکێ بە، لەوانە تکا
ئێستا و دواییمان ببێ بەخۆشی
(خودا) چاو لەسوچمان گشت بپۆشی
ئەبێ دەربڕین بۆ (خودای تەنیا)
کەچاکەی هەیە وەك کەفی دەریا
چاکەی لەژمار نایەتو نایە
گەورەی گەردوونە وەبەتوانایە
هاوار و هانا بۆ دەرگای (ئەو) بە
لەپەرستنی وریا و پێشڕەو بە
(خوا) بەزەیی (خۆی) گشتمان ببینێ
رشتی کوڕنوش بین لەگەرمە برینێ
(ساڕێژ) پێت ئەڵێ سوپاسگوزاری
بەندە و هەموو شت بەشەرمەزاری
دەربڕین بۆ (خوا) نەك بەس بەزوبان
چاوپۆش بێبۆمان، لەگشتی تاوان

هەولێر
٢٠١٨/٣/١١

## بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

## پێشەكی:

پێشـەكی سوپاسـی هەسـتی ناسـكتان ئەكـەم، وە ڕێـز و پێـزانینم بـۆ گشـتتان هەیـە، كـە ئـەم ئـەرك‌و ماندووبونـەتان گرتـە ئەسـتۆی خۆتـان، وەبەتایبەتی سوپاسی (مامۆستا ئاكۆ عباس) ئەكەم كە ئەم ماوەی بۆ ڕەخساندین كەبەم بۆنەوە هەڵسان، وەئێستاش لەناخی دڵمەوە هەستی خۆم دەردەبڕم وەكو یادگاری یەك بەم هۆنراوەی خوارەوە، بەناونیشانی خانانشینی لەبەرواری (٢٠١٧/١/٥)ی ز كەرێكەوتی ڕۆژی پێنج شەممە بو:

هەولێر

٢٠١٧/١/٥

## خانەنشینی

بـــــۆ خانەنشـــــین دەســـــتووریان وایـــــە

كـــــەوا پشـــــوویان لـــــەبۆ دانایـــــە

تـــــا ئاســـــوودەبین وەفـــــەرامۆش بـــــین

لەمدەرفەتانـــــەی تەمـــــەنمان مایـــــە

ئەگـــــەر ئەپرســـــی بـــــۆ ئـــــەم تەمەنـــــە؟

(٦٣) ســــــاڵی، پەســـــــند كرایـــــــە

(٦٣) ســـــاڵمان بـــــۆ دەســـــت نیشـــــانە

كەتەمەنێكـــــــە پـــــــیرۆزە وایـــــــە

ئەمـــــەش لاســـــایە بـــــۆ پێشـــــەوامان

كەپێغەمبـــــەرە (د.خ) نێـــــردراوی (خوایـــــە)

ئەگەر ئێمە گشت قوتابی ئەو بین
کاری وەهامان پێ سپێردرایە
گەر بەدڵسۆزی پەیڕەویان بکەین
(خوای گەورە) بۆمان، پشت و پەنایە
یەك لەکارەکان خوێندەواری یە
جێی ڕێزە هەردەم وەئاشکرایە
پەیامی سەروەر فەرامۆش نەکەی
لەسەری بڕۆی بۆت پێشەوایە
چەمیش بێ چەقەڵ هیچ کاتێ نابێ
کەسێ بەدکار بێ نایەتە ڕایە
سوپاسی (خودا) ئەکەم یەکەم جار
کەوا تەمەنم گەییە ئەم پایە
هیوامە ئێوەش تەمەن درێژ بن
لای (پەروەردگار)، سووکو سانایە
ئینجا سووپاسی (مامۆستا ئاکۆ)
ئەکەم.. وەڕێزی لەناو دڵمایە
ڕێزدارە لەلام مامۆستا فاخر
نەك وەك کەسووکار بەڵکو برایە
(خوا) پایەداری کا لەگەڵ ئێوەش
جێی متمانەیە و جێگای بڕوایە
کەبەهۆنراوە ڕێزی لەمن نا
کەشی لەباری هێنایە کایە
بەم کۆڕە (سارێژ) ناخی سارێژە
کەدڵسۆزیتان، لەبۆ من مایە

یـــــــــــادی ڕۆژی وا لام بەبەهایــــــــــــە
(یـــــــادی ١/١١) ئـــــــــەمینێ و مایـــــــە
لـــــەش ســـــاغ و ئاســـــوودە و دڵنــــەوا بـــین
مـــن و (ســـرود خـــان) ئێـــوەش (خودایـــە)
لـــــــەکۆتا ڕێـــــــزم بـــــــۆ مامۆســــــــتایان
خوشـــــکو بــــرا بـــــوون لـــــەم ماڵئاوایـــــە
ئــــــــــیتر بـــــــــەخواتان ئەســـــــــــپێرم

سوپاس

هەولێر

٢٠١٧/١/١١ی ز

ڕێکەوتی ڕۆژی چوارشەممە

## لەناو گڵستان

چـــــــەپکە گـــــــوڵێکم لــــــەناو گڵســــــتان
بـــــۆ هــــــات بـــــەدیاری لای گـــــوڵ لەگوڵـــــدان
لای مامۆســــــتای دیــــــار (مامۆســــــتا فــــــاخر)
پــــێم درا پـــــاش هـــۆنراو خوێنـــــدن بەوەســـــتان
پـــــــاش مــــــاچ کردنـــــــی یـــــەك لـــــــە (١/١١)
خـــــەڵاتم گـــــوڵ بـــــو دەســـــت لــــەناو دەســـــتان
ســـــــاڵی دوو هـــــــەزار لەگـــــــەڵ حەڤـــــــدەدا
وەك یادگـــــــاری بـــــــو، وەکـــــــو ڕێزلێنـــــــان
ئەمەکـــــدار بـــــۆ وەی، کــــــەس لــــــەیاد ناکـــــا

خـــــاوەن هەڵوێســــــتە لـــــەبواری ژیـــــان

ئـــــەم دیارییــــــە دیـــــاری تایبەتــــە لـــــەبۆم

ســــەنگینە کـــار ســــەنگ هــــەردەم لــــەجیهان

بـــــەڕێزە کەســــێ ســــەنگی خـــۆی نوانـــــد

بــــــەپاداش بگــــا بەفــــــەرمان (یــــــەزدان)

کۆمـــــــــەڵێ ڕێــــــــزدار لەمامۆســـــــــتایان

هـــەر بەمـــــەرام بـــوون، بـــەم کـــۆڕە هەســـتان

هەولێر

٢٠١٧/١/١٢

## دوێنێ بو

**ئـەم چـوارینەیە لەسـەر (م. فـاخر محمـدأمین شـەقڵاوەیی دانـراوە) لـە ٢٠١٧/١/١٢ بەناونیشانی دوێنێ بو.**

**دوێنـــێ بـــو گوڵمبـــۆ هـــات لـــەلای (گـــوڵ)**
**ڕێـــــزدارە ڕێـــــزی لـــــەمن نـــــا بـــــەدڵ**
**برایـــــەتی لەگـــــەڵ پیـــــاوی گـــــەورە و زل**
**پەشـــــیمان نـــــابی ئـــــەوە باریـــــە مـــــل**
**بیســـــــتوومە دڵ ئاوێنـــــــەی دڵانـــــــە**
**ســـەیری ئەمـــە کـــە، پەنـــدی چـــەند جوانـــە**
**جـــێی ئـــــەم قســـــانە لەســـــەر ســـــەرانە**
**لەهـــەڵ بـــاز مـــەدە خـــۆت لێ مەکـــە شـــل**
**نـــــاوی پـــــیرۆزی (فـــــاخر) دانـــــراوە**
**کـــــەباوکی نـــــاوی بەمـــــە دانـــــاوە**
**ئـــــەبینم ئـــــەم نـــــاوەی لێ وەشـــــاوە**
**ماشـــــاء الله ی لێ بـــــێ ئەکەوتـــــە بـــــەر دڵ**
**دەســـت دە.. بەدەســـت پیـــاو دەســـتت بـــەرنادا**
**لـــــەڕێڕەوی خـــــۆی ئـــــەڕوا لانـــــادا**
**ڕاســـت بـــی بـــۆی.. ڕەنجـــت بەبـــەر بـــا نـــادا**
**جێـــی پشتبەســـتنە پشـــت تونـــدە نـــەك شـــل**

**٢٠١٧/١/١٢– هەولێر**

# گەندەڵی

گەنـــدەڵی دزیـــە پیشـــەی پیـــاو نیـــە

دز حیـــزە هیچـــی لەبەرچـــاو نیـــە

ســـۆنە تـــەڕ نابـــێ دڵ بـــەزام نیـــە

چـــێژی بەرەکـــەی لام بـــەتام نیـــە

مـــاڵی گەنـــدەڵی مـــاڵێکی پیســـە

پیـــاوی پـــاك بـــۆ وەش بەمـــەرام نیـــە

گەنـــدەڵ ڕاهـــاتووە هـــەر لەبـــەدکاری

لەخاوێنیشـــــا بـــــەردەوام نیـــە

هەولێر

٢٠١٧/١٢/١٢

## چیا گیان

مامـــــه ســـــەعید نـــــیم لەدوکانـــــەوە
لەشــــەحنت دانـــــا بـــــێ لێکدانـــــەوە
لــــــەبێزاریا واقـــــــم وڕمـــــــا بـــــــو
مـــــن شــــــەرمم ئـــــەکرد بەزوبانـــــەوە
هەنـــــدی پێـــــت بڵـــــێم بەتەلـــــەفۆنا
کـــــەی دێ بەدەســــــتی چـــــیا گیانـــــەوە
بـــــۆ جـــــاری دووەم لـــــەناو دوکانـــــێ
وتـــــی دواکـــــەوتی نـــــەك بەتانـــــەوە
کـــاك حـــاجی ســـعید زوبـــان شـــیرین بـــو
تـــــۆش ڕێـــــزت لێنـــــا هـــــەر بەمانـــــەوە!
کـــاك ســـعید ویســـتی تـــیرێ بهـــاوێ
واتـــــــه بچـــــــێژی پەشـــــــیمانەوە
لـــەم بابەتـــه نـــیم چـــیا گیـــان ئۆخـــەی
بێـــزار بم بەدەســـــت بـــــرازای جوانـــــەوە
چاویشــــم بـــــو بەجیســـــکی هەیاســـــی
بـــــۆ ئـــــەنجامی ئـــــەم نووســـــراوانەوە
ڕاپـــــۆرتی (لاڤـــین وەرانیـــــە)ی خوشـــــکان
بـــــوە شــــــانازی دڵ وەزوبانـــــەوە

هەولێر
٢٠١٧/٧/٤

## فەرامۆشی کە

کەکارم پێتە گەلێ نابوتی
هەروەکو ڕێگر لێم بوی بەلووتی
پیاو ئەبێ کاتی لێقەومان پیاو بێ
کارم پێت نیە، چی بی بۆ خۆتی
پیاو بە هەستیار بە لەتەنگانەدا
کارا بە، نەوەك، ولاغبی لەجوتی
ولاغ لەجوتی بێ، سەرقاڵە هەردەم
ماندو، گۆشەگیر، وەخۆیو خۆیتی
چ جێی ئەستەمە کەسێ کەوابێ
بەداخ! هەر ئاگای، لەنان و دۆیتی
دە تۆش، هەڵبستە فەرامۆشی کە
ئەوەی ناپیاوە هەر کەیفی خۆیتی
ئەڵێن تۆز لەقوڕ هیچ کات هەڵناسێ
کەسێ پێویستی پێیە ڕۆڕۆیتی
ناڕەسەن هەردەم گوێ لەکەس ناگرێ
بۆت نایەتە ڕا سوودی بۆ خۆیتی
کەس بەنان و دۆی کەسی تر ناژی
ماری قەرب سەر بەخاوەنی و خۆیتی

هەولێر
٢٠١٧/٢/٦

## رازی دڵ

ڕازی دڵ لـــــــەناو زارتـــــــا کەدەرچـــــــو
بزانـــــــە ئـــــــاوی کـــــــولاوە هەڵچـــــــو
ئێســـــتا وریابـــــە هـــــیچ مەیدرکێنـــــە
کـــــەدرکا برینـــــە، هـــــەر بـــــەرەو زەڕ چـــــو

هەولێر
٢٠١٥/٦/٣

## نازی خەو

کەخەو نازی لەسرما کرد ئەبێ نازی ئەمن ڕاگرم
کە نازم ڕاگرت لەم کاتە ئەبێ بەم شێوە پێ داگرم
کە نازی خۆینواند کاتێ لەکاتی شەو بو بڕوانە
بەناچاری بۆ دابینبوم بەڵام بەرگەی ئەوی ناگرم

هەولێر
١-٢٠١٨/١٢/٢ شەممە- یەکشەممە

# داری بەردار

دارێ بەردار بێ گشت لقی شۆڕە
خاکی یە هەرچەند جوانە وەك پۆڕە
نایەوێ هیچ کات بسەنێ تۆڵە
رووی لە (خودایە)، خاکی بێ بۆرە
کوڕنوش بەریشە بۆ (خوا) بەم جۆرە
بۆ وایە؟ چاوساغ بینینی زۆرە
بەلای هەموو کەس زانا و خاکی یە
هەردەم کەراش خوار، هێمای چاکی یە
هەر کار پەسندە لەزگماکیە
بۆ هەموو کەسێ وەکو کاکی یە
برا گەورەش ئەبێ بۆ گچکە باش بێ
نازیشی ڕاگرێ هەروەك بابی یە
کەسانی نەزان لەبەد خۆراکین
تووشی باعزی و سەرکێشی هاتین
داریش بێ بەر بێ هەر بەرز ئەبێ
بەم بەرزیەش خۆی لا پێ تەرز ئەبێ
واتە کەم زانست لادەرە لەڕێ
بەرامبەرت هات لادە لێی هەرێ
لەسەر تێزیشە گڵپە و ئاگرە
کردەوە چروك نامۆ وەشڕە

هەولێر
٢٠١٨/١١/١٧

## پێشەنگی قەتار

ئەگـــــەر پێشــــەنگی قــــەتارت كـــــەرە
وریابــــــــە هـــــــــەردەم لــــــــەزەڕە زەڕە
كاریشـــــت ئەگــــەر بـــــۆت ســـــانا نـــــەكا
خۆتـــێ ئـــــەقوتێنێ و بـــۆ نـــاوەك ســـــەوەڕە
تكایـــــە نەكـــــەی پشـــــتی پـــــێ بەســــــتی
جــــێی بـــــڕوا نیــــە و بـــێ پشـــــتو بـــــەرە
گەرمــــــە تەریقــــــە و هـــــــەركاتێ ویســـــــتی
هەڵئەچــــێ و نیســـــكە بـــێ پشـــــتو بـــــەرە
ئـــــــەم پێشـــــــەنگەیەش ئەســــــیرت ئـــــــەكا
كۆتـــــا ئـــــــەنجامی ئەمـــــــەش هـــــــەر زەڕە
تـــــۆش نەكـــــەی گـــــورگ بخەیتــــە كـــــۆرت
خـــــۆت بخەیتــــە نـــاو گێـــژاو ئـــــەم شـــــەڕە
نەكـــــەی تـــــێی بگـــــەی بەبەچـــــكەی پیـــــاو
وەیـــــاخۆ دای نـــــێی گوایــــــە ســـــــەنگەرە
یـــــەك خـــــۆی نەناســـــێ كەســـــیش ناناســــــێ
بەرامبــــــەر گشــــــتمان هـــــــەر لەناوبــــــەرە
لەگــــــەڵ هـــــــەموو كـــــــەس تێكـــــەڵاو مەبـــــە
گشـــت كـــەس ڕانـــاگرێ بـــۆت ئـــەم لەنگـــەرە

هەولێر

٢٠١٨/١٢/٣١ دووشەممە

## داهاتو نادیارە

(خوای گەورە) بۆمان چاوی بپۆشی
لەهەڵەی بەندە کەلەکەمهۆشی
-جار هەیە تووش دێتن بەناخۆشی؟
ئارامی چەندە؟ بڵێ بۆ بۆشی؟
سەرنجی قووڵدە، ژیان تێکەڵە
هەردەم لەخۆشی وەلەناخۆشی
کەواتە دیاری یەك لەلای خوای گەورە
بێ وەری گری هەر بەڕووخۆشی
بەڵام هەر یەکمان کەتێدەکۆشی
ماندوو نەناس بێ زۆر بەپەرۆشی
بەئاواتی وەی بەهاری تەمەن
رۆژێ بڕوژێ خۆشی بنۆشی
خوازیارم کەوا (کردگاری پاك)
ئێمە و گشت کەسان زەنگین کا هۆشی
لەدەرد و بەلا دوورمان خا هەردەم
ماوەی ژیانمان پڕ کا لەخۆشی

هەولێر
٢٠١٩/١/٩ چوارشەممە

## ڕەسەن و پێچەوانەی

ڕەسەن تووڕەش بێ پێ هەڵنابڕێ
ئاژاوە هیچ دەم بۆ خۆی ناكڕێ
لەناخیش هەڵچێ تیا دەهێڵێ
پەیوەندی بەیەكجار لێت نابڕێ
بایی پەیوەندی كۆن هەر دەهێڵێ
مافی هیچ كەسێ ناچێ بشێلێ
گۆشتیشت بخوا ئەبێتە دۆستت
یەسكت ناشكێنێ و پێ هەڵنابڕێ
بەڵام ناڕەسەن هەر كوڕی ڕۆژە
ئەی بینم هەروەك گوڵەبەڕۆژە
كوێ پاروی چەورە زوڕوی تێ ئەكا
پارێزی لێی كە دووربە لێ ی تكا
لەلای كێ هەبێ هەنگوین لەگۆرە
روو هەر لەو ئەكا جا لەهەر هۆزە
ناڕەسەن شەرمی بشكێ ئەتخوا
بەچێت دانانێو دەستی لێت ئەشوا
لەناو قوڕدابی شەقت بۆ داوێ
زەیی پێت نایە و ئەتخاتە داوێ
هەر هەندە كەوا رووی پیسی كراوە
چاكەی هەر نابێو لەكاری خاوە
بەنانێكی جۆ ئەتگۆڕێتەوە
پەیوەندی لەگەڵتا ئەبڕێتەوە
هەر هەندە خۆشە تا شەرمی ماوە
كەشەرمی شكا وڵاغە نەك پیاوە

هەولێر

٢٠١٩/١/١٧ پێنج شەممە

# هیوام

هیـــــوام هیواکــــــەی هــــــەموو گەلانـــــــە
هیـــــوام گوشـــــادی و خۆشـــــی ژیانـــــە
هیـــوام خۆشــــبەختی و جـــوانی جیهانـــــە
نــــاو دڵـــــی خـــــەڵکان بکـــــەی بەلانـــــە
دووری چـــــاکە بـــــی لێـــــت دەدەن تانـــــە
چـــــاکەکار هـــــەردەم شـــــێری مەیدانـــــە
ڕێـــــزدارە لامـــــان بـــــوە جێـــــی متمانـــــە
دۆســـــتی کەســـــانە هـــــی خـــــۆ و بێگانـــــە
(ســـــاڕێژ) تـــــۆ هیـــــوات هـــــەبێ بەمانـــــە
ماندوونەناســـــیش جـــــێی پشـــــت بەســـــتانە
رووخـــــۆش هـــــەر دۆســـــتی خـــــودا و بەندانـــــە
پەســـــــندە بۆیـــــە خـــــــۆراکی گیانـــــــە
خـــــەنی بـــــۆ کەســـــێ کـــــەوا یەکســـــانە
لەئاســـــت هـــــەموو کـــــەس هـــــەروەکو شـــــوانە
ئەنـــــــدامی لەشـــــــی وا ڕاهـــــــاتووە
نازیـــــان بـــــەپاکی دەســـــت و زوبانـــــە

هەولێر
٢٠١٩/٢/١

## کاری (خوای مەزن)

بێـــوەی بزانـــی، کـــەی دێـــتن ئەجـــەل؟
ژینـــت بەســـتراوە هـــەردەم بەئەمـــەل
جـــار هەیـــە مـــاوەت کـــەم مـــاوە بـــژی
ئێســـتاش کـــۆی ئەکـــەی سـامانت لەهـــەل
(خـــوا) نـــەی ویســـتووە بەنـــدە بزانـــێ
کـــەی ئـــەمرێ تـــاکو نـــەبێ بەتەمـــەڵ
تـــا هـــەوڵ بـــدا لـــەماوەی ژینـــی
لەکۆشـــش دا بـــێ هـــەر بەپەلـــە پـــەل
لەبـــەروەی مـــاوەی ژیـــان نادیـــارە
ناچـــاری لەهـــەوڵی هـــەر بـــەبێ گێچـــەڵ
کـــار بکـــە و پشـــتت (بـــەخوا) ببەســـتە
نەپـــەك کەوتـــەیو نـــەگێڕ و نەشـــەل

هەولێر
٢٠١٩/٢/٢

## پیاوی بێئەمەك

تـــەمات بـــەپیاوی بـــێ ئەمـــەك نـــەبی
کەســـێ بـــێ ئەمـــەك بـــێ ئـــەبێ چ بـــی
ئەمـــــەك پەیوەســــــتە بەکەســــــایەتی و
خـــودی هەڵوێســـتکەر کەپابەنـــدی تـــی

هەولێر
٢٠١٩/١/٣١ پێنج شەممە

## دوو نیشانە شکێن

بـــەهیچ جـــۆر تـــیرێ، لـــەدوو نیشـــانە
نـــادا بـــەهیچ جـــۆر، قســـەکە جوانـــە
ئـــەوەی کـــەداوای ئـــەم کـــارە ئـــەکا
بەڕاســـتی گێـــل و گـــەوج و نەزانـــە
دەســـتووری تـــەواو بەئاشـــکرا دیـــارە
بێگومـــان بـــە لێـــی، لـــەم لێ داوانـــە

هەولێر
٢٠١٩/٢/٣

## چاودێریم

لەگشـــت کاریبـــاش، مانـــدوو نـــەناس بـــی
خولیـــای ڕووخۆشـــیت، تیغـــی المـــاس بـــی
لەباســـی خـــەڵکان، دوور دەنگوبـــاس بـــی
لەچـــاکە مەبـــە بـــەدەرزی داس بـــی

هەولێر ٢٠١٩/٢/٥ سێ شەممە

## کەماشەت پێ بی

کەماشـــــەت پێبــــی، خـــــۆت بپـــــارێزە
دەســـت بـــۆ ئـــاگر بـــەی، ئێشـــی بـــەهێزە
کەســـــانی نــــــەزان، بەهەڵــــــە ئەچــــــن
بــــــەناو ئەکـــــەون، وەك کــــــەری دێــــــزە
قـــەرزاری (خـــودابن)، کەهۆشـــی پـــێ دایـــن
بــــەکاری دێـــــنین، پەیوەســــــت بـــــەڕێزە
(ســـاڕێژ) پێـــت ئـــەڵێ، لەدەســـتی نـــەدەی
هـــــەر چـــاکە کـــار بـــە، چـــێژی بـــەپێزە
لەشـــــی بـــــەبێ هــــۆش، وەکــــو بۆدیـــــە
وەك کــــەری چــــەموش، هــــەر لەســــەر تێــــزە

هەولێر
٢٠١٩/٢/١١ دووشەممە

# دایکم

دایکــم بــۆ خۆشــیم، هــەردەم پــەرۆش بــو
بـــۆ بەرژەوەنـــدیم، زۆر جگـــەرگۆش بـــو
چـــەند بڵـــێی دایکـــم، لـــەبۆم بەســـۆز بـــو
بـــەبێ ئەنـــدازە، لـــەبۆم دڵســـۆز بـــو
دایکـــم لەئاســـتم، ڕێـــزی پـــێ ئـــەدام
لـــەهانام ئـــەهات، هـــەم بـــەئێش و زام
دایکــم بــو ئەیویســت، خــۆش بــا ژیــانم
بـــەزار و بـــەدڵ، ئـــەبوە قوربـــانم
دایکـــم بـــو کـــەوا، پـــەروەردەی کـــردم
ســـەنگی پـــێ ئـــەدام، وەگـــەورەی کـــردم
دایکـــم لـــەباوەش، خـــۆی ئـــەی نوانـــدم
شـــیری پـــێ ئـــەدام ســـۆزی بزوانـــدم
دایکـــم ئـــەی شوشـــتم، پـــاکی ئـــەکردم
بێگومـــان ئـــەو نەبوایـــە ئـــەمردم
دایکـــم بەنـــەرمی، ئـــاوازی ئـــەوت
تـــا لەبێشـــکەدا، خـــەو لـــێم ئەکـــەوت
خـــۆم بەقـــەرزاری، دایکـــم ئـــەزانم
چـــی پـــێم بکـــرێتن، چـــەندی بتـــوانم
بـــۆی ئـــەنجام، ئـــەدەم ئـــەنجامێکی بـــاش
بـــاش بـــی لای (خـــودا)، وەرئـــەگری پـــاداش
ڕاســـپاردەکی، بـــۆت هەیـــە (ســـاریژ)
بـــاش بـــی بـــۆ دایکـــت، لای وەرئـــەگری چـــێژ
چـــێژێکی زۆر خـــۆش، پێـــی دلشـــاد ئـــەبی
لەدلشـــادیا، پێـــی گوشـــاد ئـــەبی

هەولێر

٢٠١٩/٢/١٥ هەینی

# ناسینی مرۆڤ

هەرکـــەس ئەناســـرێ، بەهەڵوێســـتی خـــۆی
بـــەم جموجۆڵـــەی، ئـــەنجام ئـــەدرێ بـــۆی(١)
کاردانـــــــەوەی وەش کـــــــار لەهونـــــــەرا
-ئـــەکا بـــێ نـــاو هێنـــانی کەســـە بـــۆی(٢)
کاردانـــــــەوەی هونـــــــەریش هـــــــۆنراوە
لەســـــــەریا تۆمـــــــار ئـــــــەکاتن بـــــــەهۆی

---

(١) بەم هەڵوێستەی کەئەیکا.

(٢) ئەم کەسەی کەهەڵوێستەکەی نواندووە کار کەرەکە واتە بکەرەکە (فاعل)ەکە.

٢٠١٩/٢/١٨ دووشەممە

هەولێر

٢٠١٩/٢/١٨

## دامەن پیسی

گـــورگ دامـــەن پـــیس، نیـــە بـــۆ هاوســـەر
لـــــەم بەدڕەوشـــــــتیە، هاتووەتـــــــە دەر
راســــــتە ئاژەڵـــــــە، بـــــەس بەئەمەکـــــــە
لــــەم خـــوە پیســـە، خـــۆی گرتـــوە بـــەدەر
هەنـــــدێ ئـــــادەمیزادی دامــــــەن پـــــیس
لەئاســـت هاوســـەری خـــۆی بـــوە بەدفـــەڕ
کەســـانی دامـــەن پـــیس دیـــارن وەك کـــەر
نـــەوەك کـــەر بـــەڵکو هـــەر بڵـــێ ماکـــەر
دامـــــەن پیســــــاتی لـــــەبۆ هاوســـــەری
ژن هـــەیبێ یـــان پیـــاو بـــێ پشـــتە بـــەزەڕ

هەولێر

٢٠١٩/٢/٢٤ یەکشەممە

## هەر قسەك بیکەی

قســــەك کەئەیکــــەی بــــاجی لەســــــەرە
بـــــەڵام کــــەباش بـــو تاجـــت لەســــەرە
کـــــەخراپ بـــو قــــەرپی ســــەر بەخاوەنیــــە
قسەشـــــت لـــــەجێبێ بــــۆ تــــۆ بــــەرە

هەولێر

٢٠١٩/٢/٢٢ هەینی

## بەرهەمی خاکی

هەرچــی پێــی ئــەژی بەرهــەمی خاکــە
هەربۆیــە ئــەڵێم خــاك وەکــو داکــە
چــەند بڕوانیــە خــۆت دروســت بــوی خــاکی
دەســت کــردی (خــودای مــەزن و بــێ بــاکی)
لــەناو گۆڕســتان گــۆڕ هەڵمەشــێلە
بەســەریا مــەڕۆ بــەجێی بهێڵــە
پــڕی چــاو جــوانن لەمــە جــوانترن
رۆڵــەی نــازداری نــاو نــاخی دڵــن
لــەخاك دروســت بــوی دەچــیەوە نــاوی
لێ ی دێــوە دەرێ (خــوا) وای دانــاوی
ئــەوەی هۆشمەنــد بــێ وە ڕێکــو ژیربــێ
ئــەبێ (خــوای گــەورەی) هــەرگیز لــەبیر بــێ

هەولێر

٢٠١٩/٢/٢٣ شەممە

## نیشانەی دووڕوو

دووڕوو لەسـێ خـاڵ دەسـت نیشـانکراوە
لـەزمان درۆزن دیـارە پێشچـاوە
لەدەسـتی دزە شکسـتەخاوە
بـێ بەڵێنیشـە ئەمـەش لـەملاوە

هەولێر
٢٠١٩/٣/٢٩ هەینی

## هەستیار بە

گـوریس کەتونـد بـو بزانـە ئەپسـێ
کـار هەیـە نـاڕوا بـێ زۆرەملـێ
شووشـە کـەهێزی کەوتـە سـەر ئەشـکێ
سـتەمکار کۆتـا بەفـەرمانی دێ
ژیـن وا ڕۆییـوەو وا ئـەڕوا بـەڵێ
بشـتوانی بەکـەس نەکـەی گێچـەڵێ
دەسـتووری ژیـان هـەردەم پێـت ئـەڵێ
بـەری مانـدوو بـون بخـە باغـەرێ
هـەموو سـەرەتا کۆتـایی پـێ دێ
نـاڕەوا مەبـە کـەبۆت هـات هـەڵێ
هـەر ڕێگـە ئـەڕوا بـۆ شـارێ یـا دێ
لای ڕەسـەن بـەتۆ بـا هەرکەسـێ بـێ

هەولێر
٢٠١٩/٣/٣٠ شەممە

# گۆڕانی ژین

ڕووناكی لەپاش تاریكی شەو دێ
ئاسوودەی یەكەم پاش تێری خەو دێ
كاسەی پڕ پاشی تەنگی ژینا دێ
دڵخۆشی پاشی ڕق و كینا دێ
ژیان و مردن لەیەك ئاست نیە
تێبگەی دیارە وەبەخواست نیە
ئەمانە گشتی لەدەست (خودایە)
لەدەستی نەدەی خۆشی و سەرمایە
(سارێژ) پێت ئەڵێ ژیان گۆڕانە
تێبگەی ئەمە دروشمی جوانە

هەولێر
٢٠١٩/٣/٣٠ شەممە

پێشەکی:

لەڕێکـەوتـی (٢٠١٩/٤/٦) کـەڕۆژی شـەممە بـو (قوتابخانـەی گـەردوون و شـەیدا) لەگـەڕەکی مامۆسـتایانی زانکـۆ (٢) فیسـتیڤاڵێکیان ئەنجامـدا وەبـەم بۆنەیـەوە کارتیـان بـۆ نـاردبووم و بـانگ کرابـوم، منـیش ئـەم هـۆنراوەی خـوارەوەم بـۆ ئامـادە کـردن بـۆ فیسـتیڤاڵەکە وەلـەهۆڵی فیستیڤاڵەکە کەتیای ئەنجام درا هۆنراوەکەم بۆ خوێندنەوە لەسەر شانۆ بەناوی (پیرۆز بێ) وەئەمەش هۆنراوەکەیە:

## پیرۆزبێ

پێشـــەکی بـــەدڵ ئـــەڵێم نـــەك بـــەزار
جێـــی هانـــا و پەنایـــە (پـــەروەردگار)
بـــەناوی دەســـــتەی بەڕێوەبـــەری
گـــەردوون و شـــەیداوە بەئەوپـــەڕی
نـــاخی دڵ بـــەخێرهاتنتان ئەکـــەم
بـــبن بەچـــرا و مەشـــخەڵی ســـەردەم
گـــەردوون و شـــەیدا لانـــەی زانســـتن
هاوبەشـــی یـــەکن لـــەبۆ ســـەرکەوتن
مانـــدوو نەناســـی خـــاکو ولاتـــن
لـــەبۆ پێشـــوازی فیســـتیڤاڵ هـــاتن
ئیمـــڕۆ بـــەهاری ئـــازادی کـــوردە
کـــەلتوری ڕەســـەن زانســـتی وردە
زانســـت هاوچـــەرخە ڕازاوەتـــەوە
شـــوێنی پێشـــڕەوی خـــۆی گرتۆتـــەوە
لـــەناخی دڵا پـــیرۆز بـــێ لێمـــان
ببـــێ بەمایـــەی شـــانازی بۆمـــان

هەولێر

٢٠١٩/٤/٦ شەممە

## چ ئاو چ ئاگر

چ ئـــاو چ ئـــاگر پشـــت پـــێ‌ی مەبەســـتە
لێ ی بـــێ غـــەم مەبـــە لـــەم خـــەوە هەســـتە
لـــــووڵی ئـــــاو خنكـــــانی لا مەبەســـــتە
تێنــی هــەردووكیان گشــت كــەس لێ ی پەســتە
بۆیـــە (خـــوای گـــەورە) كەئـــەت ترســـێنێ
بـــــــــەئاگری دۆزەخ دات ئـــــــــەمركێنێ
جیـــــاوازی ئـــــاگری دۆزەخ و جیهـــــان
هەنـــــدە بەســـــامە هـــــەر ئەتپســـــێنێ
تێنــی هــەردووكیان گشــت كــەس لێ ی پەســتە
بەتایبـــەت دۆزەخ چـــەند بڵـــێ‌ی خەســـتە
كەواتـــــە گـــــومڕا نـــــەبی و بزانـــــە
گشـــت كـــارت لەدەســـت (خوایـــە) لێزانـــە
ڕێنمـــات ئەكـــەم بـــە (خـــوای باڵادەســـت)
پـــــــەروەردگاری بێگیـــــــان و گیانـــــــە

هەولێر

٢٠١٩/٣/٢٠ چوارشەممە

# هونەرمەند

هونەرمەنـــد پاشـــخۆی بەرهـــەمی دیاربـــێ

هونەرمەنـــــد بەبەرهـــــەم پایـــــەداربێ

هونەرمەنـــد کـــارا بـــێ بـــەهادار بـــێ

هونەرمەنـــد لـــەدڵبێ نـــەك لـــەزار بـــێ

هونەرمەنـــد شـــیرین بـــێ نـــەوەك تـــاڵ بـــێ

هونەرمەنـــد بەرهـــەم گـــەیی نـــەك کـــاڵ بـــێ

هونەرمەنـــد لـــەلای خوێنـــەرا مـــاڵ بـــێ

هونەرمەنـــد لـــێ هـــاتوی بـــازو داڵ بـــێ

هونەرمەنـــد تێشـــوی دواڕۆژی مـــاڵ بـــێ

هونەرمەنـــد بـــاوەڕدار بـــێ خۆشـــحاڵ بـــێ

هونەرمەنـــد شکســـت نـــەینێ وەزاڵ بـــێ

هونەرمەنـــد گـــومڕا نـــەبێ لات خـــاڵ بـــێ

هونەرمەنـــد لێـــزان بـــێ وەعـــەوداڵ بـــێ

هونەرمەنـــد چـــاکەی هـــەردەم بـــەماڵ بـــێ

هونەرمەنـــد لامـــان هـــەر مـــام و خـــاڵ بـــێ

نـــەك جـــێی هونەرمەنـــد لـــە وەیلـــی چـــاڵ بـــێ

هونەرمەنـــــد وابـــــێ وا بـــــەهرەدار بـــــێ

هونەرمەنـــد خۆشـــنوودەی (کردگـــار) بـــێ

هونەرمەنـــــد کاتـــــێ بـــــەم شـــــێوە بـــــڕوا

بێگومـــان ئەبتـــە خۆشەویســـت (خـــوا)

هەولێر

٢٠١٩/٤/٢٩

## تكام

وریـــــای زمـــــان بــــە، لــــــەكاتی دوان
لـــــــەكاتی دوان، وریابـــــــە قوربـــــــان
بـــــەرز مـــــــەنوارە ئەكەویـــــــە زیـــــان
لــــەژێر چـــاودێری (خــــودای) بێگومـــان
لـــووت بـــەرزی هـــەردەم ئەكەوتـــە تـــاوان
ڕاز دیــــارە لای (خــــوا) تەنانــــەت پـــەنهان
پیـــــاوەتی نیـــــە لـــــەخۆبایی بـــــوون
وابــــی بــــێ ســــەنگی هــــەردەم بێوچـــان

هەولێر
٢٠١٩/٥/١٢ یەكشەممە

## سەرنجی كات

بەرامبــــــەر كاتــــا ببــــە زێرینگـــــــەر
لـــــەداخ و حەســــــرەت ببــــە ئێشــــكگر
چـــۆن زێـــــڕ ئەكێشــــرێ كـــات گـــرینگترە
بـــەهای كـــات لــــەزێڕ بەســـــەنگ زیـــاترە
لەگشــــــت كارێكـــــا كاتـــــت پێویســــــتە
تـــێ گـــــەیو لەســـــەر ئـــــەم بێـــــژە ڕشـــــتە
هەربۆیـــە (خـــودا) ســـوێند بـــەكات ئـــەخوا
(خــــــودا) ئــــەزانێ كـــــاری پـــــێ ئـــــەڕوا
(خـــوا) زانـــای هـــەموو گەردوونـــە هـــەردەم
زانـــای گشـــت كـــارە لات بـــێ ناتبـــێ غـــەم
گشـــــت ئـــــەم بێژانــــەی كەباســـــم كـــــردن
لای (ســـــاڕێژ) یـــــەك بەجێنــــە و وردن

هەولێر ٢٠١٩/٥/١٤ سێشەممە

## قسەت لەجێبێ

زۆرخۆشـــــە کـــــەوا قســـــەت لـــــەجێبێ
چـــــیت لێ ئەپرســـــن وەڵامـــــت پێبـــــێ
ترشـــــو تـــــاڵ نـــــەبی لەبێـــــژەی ڕەوا
بەهەنـــــد هـــــەڵی گـــــری بەرامبـــــەر کێبـــــێ
کەوچـــــانت بـــــو لێیـــــا بـــــاز نـــــەدەی
گـــــەدا بـــــێ یـــــا شـــــا یـــــا خـــــەڵکی دێبـــــێ

هەولێر

٢٠١٩/٤/٩ سێشەممە

## سەنگت ڕاگرە

ســـــەنگت ڕاگـــــرە، ســـــەنگت ڕەنگتـــــە
ســـــەنگت قـــــوڕس بێـــــت، ســـــەنگت دەنگتـــــە
ســـــەنگت بەســـــەنگ بـــــێ، کـــــار لەچـــــەنگتە
ســـــەنگی بێبـــــەها، خانـــــەی تەنگتـــــە

هەولێر

٢٠١٩/٥/١٤ سێشەممە

## خۆ تێ هەڵنەقوتاندن

كـــــارێ پەیوەنـــــدی بـــــەتۆوە نــــــەبی
كەتێكـــــەڵی بـــــوی، ئـــــەبێ تـــــۆ چـــــبی
خــــۆت لـــــەكاری كـــــەس هەڵمەقوتێنــــــە
كـــــەواتكرد گەمـــــژە و بـــــێ بـــــەها ئـــــەبی

هەولێر
٢٠١٩/٦/١٠ دووشەممە

## پێت ئەڵێم

چـــاو لەئاســـت كـــەتنی خـــۆ كـــرد كـــوێرە
كـــات لـــــەلای ماندوونەناســـان زێـــــڕە
لەشـــــەڕدا نـــــەبی خـــــۆت لـــــەلا شـــــێرە
بـــێ ڕەوشـــت دیـــارە وەك ســـەگی دێـــرە
كـــــەس لەدۆســــــتاتی هەڵمــــــەبوێرە
نـــــازی خۆشەویســـــت ڕاگـــــرە فێـــــرە
زمـــــانی شـــــیرین هـــــەموودەم خێـــــرە
ڕوو بەخەنـــــدە بـــــە لـــــەكوێ بیـــــو لێـــــرە
پاشـــــی دز تەشـــــتی زێـــــڕ دانـــــێ لێـــــرە
ئـــــەوەی تـــــێ نـــــەگا گێلـــــە وەهێـــــرە
ڕێنمـــــایی (ســـــاڕێژ) بێنـــــە بەرچـــــاوت
بـــا نـــەڵێن هەســـتی پـــێ ناكـــا كـــوێرە
كەســـــێكی گفتـــــار و ئامۆژگـــــاریم
لـــــــەناخی ڕەنگداتـــــــەوە دلێـــــــرە

هەولێر
٢٠١٩/٦/١٢ یەكشەممە

## قسەی ڕەق

قســــەی ڕەق لـــــەجێی خــــۆی وەڵام دەوە
کەســــێ بەرپەرچـــــی نـــــەدا لەخـــــەوە
لەشـــــی زامـــــداری تیـــــغ چـــــا ئەبتــــەوە
لــــــــەدڵ قســــــــەی ڕەق ئەمینێتــــــــەوە
دڵای برینـــــــداری قســـــــەی وشـــــــک بـــــێ
کەهاتـــــــە یـــــــادی پەســـــــت ئەبێتـــــــەوە
پەنـــد ئـــەڵێ جێـــی خەنجـــەر ســـاڕێژ ئـــەبێ
(ســــاڕێژ) جێـــــی تـــــیران ئەکولێتـــــەوە
زمـــــان شـــــیرین بـــــی خێـــــرت پێئـــــەگا
بـــــا بەقســـــەی بـــــاش دڵ گەشـــــبێتەوە
ئەمـــــەش فـــــەرموودەی پێغەمبەرمانـــــە (د.خ)
بـــــا بەقســـــەی خـــــۆش دڵ بکرێتـــــەوە
دڵـــــی ئـــــەمو ئـــــەو بـــــۆ ئـــــەڕەنجێنی
بـــــا دڵـــــی خـــــەڵکان ڕوونـــــاک بێتـــــەوە

هەولێر

٢٠١٩/٦/٦ پێنج شەممە

# ناسینم

(ســـــاڕێژ) لەکۆیــــــە هاتۆتـــــە جیهـــــان
نـــاوی خـــۆی (ئەبوبـــەکرە) بـــێ گومـــان
لەســـــــاڵی (۱۰۰۰) لەگـــــــەڵ (۹۰۰)دا
کـــــــۆی (٥٤)یـــــــش لەزاینیـــــــدا
نـــــــاوی گـــــــەڕەکی لـــــــەدایکبویا
(بایزاغـــــا) بـــــو کـــــەتیایا ژیـــــا
(حـــاجی مســـــتەفا) نـــاوی بـــاوکیتی
(رعنـــــە تـــــوفیقیش) نـــاوی دایکیتـــی
(حـــــاجی عبـــــدالله) باپیرەکـــــەیتی
(چـــــلبی) نازنـــــاو بنەماڵـــــەیتی
بـــاپیری بـــاوکم (حـــاجی مســـــتەفا)
(أحمــــد) بـــاپیری باپیرمــــە وەهـــا
بـــاپیری (ســـاڕێژ) (حـــاجی عبـــدالله)
(ئەحمـــــەدیش) بـــــاپیری باپیریـــــا
بـــاپیری (ســـاڕێژ) (حـــاجی عبـــدالله)
(مســـکین رەبەنـــە) کـــەپێی ئـــەوترا
خـــۆم مامۆســـتا بـــوم لەقوتابخانـــە
لەچـــەند شـــوێنێکا ئەمـــەش ناویانـــە
(هـــیران) (بـــاوەقوب) لەگـــەڵ (کـــانی ســـور)
نـــاوی شـــوێنەکان بـــو نزیکـــو دور
(لەشـــاری کۆیـــەش) لـــەقوتابخانان
مامۆســـتا بوومـــە لـــەماوەی ژیـــان

ســــــــالّی (٨٣) لەقوتابخانـــــــــەی
(حـــاجی قـــادرا) بـــوم لەئـــەم شـــارەی
ســـــالّی (٨٥) لەگـــــەلّ (٩٠٠) بـــــو
(ســـارێژ) وانەبێـــژ بـــو لـــە (هیـــوا) بـــو
مەکتـــــەبی (هیـــــوا) لــــــە بەفرەقەنـــــدی
تـــۆ گـــــویم لێبگـــــرە گـــــەلێ بەمەنـــــدی
یـــــەك لەگـــــەڕەکی شـــــارەکەی (کۆیـــــە)
(بەفرەقەنـــدی) بـــو کـــە (هیـــوای) لـــێ یـــە
ســـــالّی (٨٦) نقلـــــی (هـــــەولێر) بـــــوم
بەراســـــــپاردە و داواکـــــــاری خـــــــۆم
لەقوتابخانــــــەی ئیســـــــلامی دانـــــــرام
(خالـــد بـــن ولیـــد)ی نـــاو بـــو ئـــەنجام
لەقوتابخانـــــــەی (قائـــــــد تێکـــــــەلاّو)
دانرابـــوم ئـــەم کـــات تەمـــەنم وەکـــلاو
لەقوتابخانـــــــەی (قەلعـــــــەی) برایـــــــەتی
وانەبێــــــــــژ بــــــــــوم بەدلّنیایــــــــــەتی
لــــــە (٨٩)دا بــــــۆ (بنەســــــلاّوا)
مــــالّم بـــــالّی کـــــرد وتم مالّئـــــاوا
دووبـــارە لەســـەر ســـکالاّی خـــۆم بـــو
کەچـــووم لـــەبۆ وێ بـــەبێ پێـــنج و دوو
لەوێشـــا چـــەندین قوتابخانـــەم کـــرد
لــــە (٩٦) ڕووم لەهــــــەولێر کـــــرد
ئەمـــەش ســـێ بـــارە لەســـەر هـــەولّی خـــۆم
هاتمـــەوە (هـــەولێر) نـــالّیم ڕەنجـــەڕۆم

**لەقوتابخانـــەی (بروســـك) و (ســـەرکەش)دا**
**وانەبێـــژیان بـــوم بـــەدڵی گـــەش دا**
**(سەرکەشـــیش) لەشـــوێن (٩٤) بـــو**
**پـــڕ لـــەخاوێنی و خزمـــەتگوزار بـــو**
**لـــەوێش بـــۆ (گـــەردوون بنـــەڕەت) هـــاتم**
**(لـــەزانکۆی دوو) بـــو گەییمـــە ئـــاواتم**
**ئەمـــەش کۆتـــایی قوتابخانـــەم بـــو**
**کـــە (ســـاڕێژ) تیایـــا خانەنشـــین بـــو**
**لـــــــــــە (٢٠١٧)ی زایینـــــــــــدا**
**بـــو بەبـــەرواری خانەنشـــینما**
**ئـــەم کـــات تەمـــەنم (٦٣) ســـاڵ بـــوو**
**(ســـاڕێژ) بـــۆ خـــەڵکان مـــام بـــو وەخـــاڵ بـــو**

**هەولێر**

**٢٠١٩/٦/٢٠ پێنج شەممە**

| ساڕێژ | باوکی ساڕێژ | باپیری ساڕێژ | باپیری باوکی ساڕێژ | باپیری باپیری ساڕێژ |
|---|---|---|---|---|
| ئەبوبەکر | مستەفا | عەبدوڵڵا | مستەفا | ئەحمەد |

## شەو

چەندی شەو کردییو ئەمن کردم خەوم هەر لێنەکەوت
چەندی پابەندی خەومبوم لانەکەی دڵ دانەکەوت
چەندی بیرۆکەی دڵی خۆم لا بەلا نا لام نەبو
خەو کەلام بو من وەکو دۆست وام ئەوێ بۆم هەڵکەوت
چەندە خۆشە دڵنەوابی نا بەجارێ پێی بی گەش
ئەم کەسەی ئاسوودەیە ڕوو گەشئەبێ بۆی هەڵکەوت

هەولێر
٢٠١٩/٧/١٧ چوارشەممە

## ئارامگر

وەرە با ئێستا من با بۆتکەم باس
گەر ئارامگر بی تۆی ماندوونەناس
ئەوی عەودالی ڕەوشتی وا بێ
سەرکەوتن بەدەست دێنێ وەسوپاس

هەولێر
٢٠١٩/٧/٨

## (التكرارُ قبيحٌ ولو كان مليحٌ)

## دووباره نەحسە

دووبـــــاره نەحســــــه هەرچــــەنده خۆشـــــه
ئەنجامدەرەكـــــــەی بـــــــۆت جگەرســـــــۆزه
پیـــــاو ئـــــەم پیاوەیـــــه كـــــەوا ڕووخۆشـــــه
پیـــــــاوەتی بـــــــەزار لام بـــــــاش‌و بۆشـــــــه
كـــــێ ئـــــەڵێ كەبـــــەدكار فەرامۆشـــــــه؟
مـــــن ئـــــەڵێم نێـــــره ئـــــەڵێی بیدۆشـــــه
پـــــــارووی باغـــــــەرت باشـــــــتر لەكۆشـــــــه
(خـــــوا) لـــــەیاد كـــــردن گـــــومڕا و بێهۆشـــــه
ســـــەرخۆش چ شـــــەو بـــــێ چ ڕۆژ مەینۆشـــــه
زەنگینێكـــــــی تێـــــــر هـــــــەر بالاپۆشـــــــه
(ســـــــاڕێژ) پێداچـــــــوونەوەت پێویســـــــته
تـــــا كـــــارت لـــــەجێ بـــــێ دڵ پەرۆشـــــه
نەكـــــەی (خـــــوا) لـــــەبیر بكـــــەی هـــــیچ كاتـــــێ
بـــــــەیادی نـــــــاوی (خـــــــودا) دڵخۆشـــــــه

هەولێر

۲۰۱۹/۷/۳۰ سێ شەممە

## ئەمجارەش

ئـــــەمجارەش ڕیســـــم لیَبـــــو بــــەخوری[١]
لەبـــــەروەی بــــەدرۆ لەســـــەرما خـــــوڕی[٢]
زیـــــاد لــــەڕادەی خـــــۆی پــــێ هەڵنــــەبڕی
(خـــــوا) هـــــەڵناگریَ، تاوانـــــت کــــڕی
نەکــــــەی لابـــــدەی لەڕاســـــتی هــــــەردەم
تـــــا (خـــــوا) پــــــەنابیَ، ڕاز ببـــــە گـــــری
(١) خور: واتە ئەم خوریەیە کەبەلەشی ئاژەڵەوە هەیە.
(٢) خــوڕی: واتــە خــۆت لەســـەرما ســەپاند و فەخفەخەت بەسەرما ئەنجامدا.

هەولیَر
٢٠١٩/٧/٢٢

## ڕوو کراوە

ڕوو کـــــــراوە زۆری لــــــــەکارا خـــــــاوە
بــــــۆ بەرژەوەنـــــدی خـــــۆی پەشـــــۆکاوە
بــــــۆ وایـــــــە؟ چـــــونکە شـــــەرمینەماوە
ئەمانــــــەی باســـــم کـــــرد لای وی بـــــاوە
خـــــەڵکی لا پـــــیرە وەپیَـــــی خـــــەلفاوە
خۆشـــــی پــــێ شـــــۆخ و پــــێ جـــوان و لاوە
هەولیَر
٢٠١٩/٨/١٨ یەکشەممە

## هاتم نەهاتم

هـــــاتم نـــــەهاتم دۆســــــتاتی خراپـــــە
بکـــــەم دە ئـــــەتۆش، دۆســــــتێکی چـــــابە
بـــــەدیو بـــــەدکاری ئـــــەنجامی پووچـــــە
ڕقـــــو کینـــــی دڵ بـــــەجارێ لابـــــە

هەولێر
٢٠ /٢٠١٩/٩ هەینی

## بەرامبەر بێ هەست

بەرامبـــــەر بێهەســـــت ئـــــارام زەریـــــا بـــــە
لەهەڵســـــووکەوتا ئـــــازا و وریابـــــە
ویســـــتی بـــــاش نـــــەبێ بـــــۆی پووشـــــو کابـــــە
کەهاتـــــە ســـــەر ڕێ ئـــــەتۆش بـــــۆی چـــــابە

هەولێر
٢٠١٩/٩/٥ پێنج شەممە

## (١) چاوەڕوانی

گۆشـــــــەگیر ئـــــــەبی بەچـــــــاوەنواڕی
کــــردەوە مەرجــــە نــــەك هــــەر بــــەزاری
ئــــارامگر هــــەردەم ئەکەوتــــە بــــەر دڵ
ڕێــــزدارە لات چــــەند.. چــــێژکا بێــــزاری

ئەستەنبۆڵ
٢٠١٨/٩/١٥

## (٢)چاوەڕوانی

چـــــاوەڕوان بــــوە دەردی کوشــــــندە
ئەمــــەی کــــەپێیا دڵنــــەوا و مەنــــدە
ئەبتــــە هێمایــــەك بــــۆ خــــۆڕاگری
ئازارەکەشــــــی بــــــەدڵا بەنــــــدە

هەولێر
٢٠١٩/٧/٤

## ژن و مێرد

ڕایـــــەكم هەیـــــە هـــــەر لێممەپرســـــە
بـــۆ قســـەی ژن و مێـــرد هەنـــدە قوڕســـە!!!
یـــا ژن وەیـــا مێـــرد لێبـــوردە نـــەبێ
ئـــەڵێم ئـــەنجامی گـــەڵێ جێـــی ترســـە

هەولێر

٢٠١٩/٩/١٣ هەینی

## پێ هەڵبڕ لەناز

نـازی كـەس هەڵمـەگرە زیـادە نازەكـەت پێنـاگیرێ
ولاّغ بـەرەڵاكردن خراپـە، قـەت جەڵـەو وانـاگیرێ
كاری مام ناوەندی گشتی، گوزەرانت ڕێك ئەخا
قـەت نەكـەی ڕادەبـەدەر، دۆسـتاتیكەی، سـەرناگرێ

هەولێر

٢٠١٩/٨/١٢

## تۆ فیلی؟!

ڕاســـتە هەنـــدێ كـــەس كـــەخۆی پـــێ فیلـــە
كەركـــەدەن هەیـــە، فیـــل بـــۆی ئەســـیرە!!
كەواتـــــە نەكـــــەی لـــــەخۆت بگـــــۆڕێی
كەركـــەدەن لەئاســـت فیـــل، شـــێر و تـــیرە

هەولێر

٢٠١٩/٨/١١

## دۆستی دوژمنم

دۆســـتی دوژمـــنم، بـــۆم هـــەر دوژمنـــە
بـــۆ وایـــە؟ بـــیری هـــەر لـــەکن منـــە
دوژمـــن بەچـــاوی ئاشـــتی نامبینـــێ
ڕقـــی ناڕەســـەن زەریـــای بێبنـــە

هەولێر
٢٠١٩/٩/٢٠ هەینی

## با هەر بمینێ

بـــا هـــــەر بمینـــــێ یـــادت لــــەدڵما
باوەڕکــــە باڵـــت، بەئەســــتۆ و ملمــــا
دلشــــادم هـــــەردەم بەدیــــدەنی تــــۆ
روخســـارت ئەکـــەم بەخونچـــە و گوڵمـــا

ئێران– بۆکان
٢٠١٦/٨/٨

## (١) جوانی

جـــوانی هەربۆیـــە بـــەخۆت ئـــەنازی
ویســـتت دیـــار بونـــە، بـــۆم بـــەنیازی
نیگـــار کێشـــراوی چـــاپی نـــاو چـــاوی
هـــەر مەنگـــە پێتـــا، پێـــی مـــەڵێ خـــاوی

هەولێر
٢٠١٥/٦/١١

## گوڵ

گــوڵ چـــەندی بڵێـــی پـــێش چـــاوم جوانـــە
پەروانــــە مەســــتە و بــــۆی پەرێشـــانە
کەســـــێ ناکەوتــــە دڵــــی نەزانــــە
هەریــــەك بــــۆ ئــــەویتر ئاوێزانــــە

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٣

## هەڵسام

هەڵســـــام ســـــەرێکم دا لـــــەباغی گـــــوڵ
تـــــا لەگـــــەڵیا بم بـــــەگیان و بـــــەدڵ
لەگـــەڵ کـــێ هەڵســـووکەوت کـــەی کارئـــەکا
ئـــــەرۆژێنی ئـــــاوێزان ئـــــەبی تامـــــل

هەولێر
٢٠١٧/٦/٣٠

## من

مـــــن بۆیـــــە هـــــەردەم گـــــوڵم خۆشـــــئەوێ
بـــــەبۆنی مەســـــتبم، خـــــەو لـــــێم ئەکـــــەوێ
جوانـــــو ناســـــکو نـــــەرمو نیانـــــە
دڵگـــــرە بۆیـــــە هـــــەردەم ئەمـــــەوێ

هەولێر
٢٠١٧/٧/١٧

## (٢) جوانی

جوانـــێ لەخۆڕســـکا جـــوان بـــێ جوانـــە
دەســـــکاری لێ کـــــرێ فـــــێڵ لەچـــــاوانە
کوڕنـــــوش بـــــۆ (خوایـــــە) بەدیمەنەکـــــەت
جـــــوانی بـــــاوەڕدار خۆشـــــی جیهانـــــە
بـــــەڵام بەراســـــتی لـــــەکردەوەدا
دیـــارە کـــێ جوانـــە؟ نـــەك بڵـــێن جوانـــە

هەولێر
٢٠١٩/١/٢٥ هەینی

## خونچەی ناسك

خونچـــە ناســـكە پـــێش بـــوونی بـــەگوڵ
ســــــەرنجێ بـــــدە زو لـــــــەناخی دڵ
خونچـــە كـــەبوە گـــوڵ شـــێوەی ئـــەگۆڕێ
ئێســــــتاش ناشـــــیرین نابـــــێ باربـــــەمل
كـــــەبای دێ پـــــەڕی گـــــوڵیش بەلەنجـــــە
شـــنەی دێـــو هـــەژان ئـــەكا نـــەرمو شـــل
خونچـــە نـــازی خـــۆی ئـــەكا و گـــوڵیش وا
جیـــا نینـــە لەیـــەك بەســـــەنگن وەزل

هەولێر
٢٠١٩/١/٣١

# بەشی ئامۆژگاری

## ڕێنمایی

ئـەوەی نـازی کەسـێ ڕاگـرێ، ئـەزانی بـاری نـاز گرانـە
ئـەوەی گشـت خـەڵکی لا جوانـە، بـەخۆی نـازدارە بیزانـە
ئـــەوەی ڕێـــزدارە لای خـــەڵکان ئـــەمانبینێ ڕێزدارانـــە
ئـــەوەی کـــرداری ناڕێکـــە، گوتومـــە هـــەر پەرێشـــانە
ئـەوەی سـووکە لـەڕەفتاری، لەهەڵوێسـتی ئـەدەن تانـە
ئەوەی شیر تیـژە بەسبێ شەڕ، ئەڵێم هەردەم پەشیمانە
ئـــەوەی تـــا ڕادە ئـــەبووڕێ، لـــەدژ داری ژیـــانی خـــۆی
ئـــەڵێم هـــەر ئـــەو ئـــەزانێ کەبـــژێتن زۆر بەمەردانـــە
ئـــەوەی نەویســـتی چاکەشـــبێ، ئـــەبینم کورتـــە زوبانـــە
ئـەوەی پیاوبـێ لـەکرداری، بـەهای هـەر تـاجی سـەرانە
ئەوەی بۆ هەرکەسێ نەیوێ، لەبۆ سوودیشـی هـەر سوور بێ
نموونـەی وانـە مـردووش بن، زینـدوون لـەڕێزی نەمرانە
مەبـە دۆسـتی گرفتـی کـۆن، لەئاسـتی خـزم و بێگانـە
ئـەڵێم (سـاڕێژ) دە بیزانـە، قسـەت خـۆش بێتـو بتوانـە
ببـــە دۆســـتی کەســـانی وا، کـــەتیمار ســـازی زامـــانن
لـەکاتی وا (خـودا) پشـتە و، بـەهات سـەنگداری سـەرانە
کەسـێکی عەشـقی چاکەشـبێ، بـۆ چـاکە ئەبتـە دێوانـە
دە تـۆش ڕێـزداری سـەنگینبە، نموونـەك بـە لـەم کەسـانە

هەولێر
٢٠١٧/٢/٧

## هەر گوڵ بچێنە

هــەر گــوڵ بچــێنە، تــا گــوڵ بــۆت بگــری
نەکــەی دڵ تــەنگ کــەی، گیــان دەرچــێو بمــری
دوا کۆتـــــــا قســــــــەم ببۆژێیــــــــەوە
چـــیت چـــاند هـــەر ئەمـــەش ئەدرویێیـــەوە

هەولێر
٢٠١٥/٤/١٦

## کاری بەجێ

کـــاری وا ئـــەنجام مـــەدە پێـــت گرانبـــی
لـــــەکۆتایی دا لێــــــی پەشـــــیمانبی
هـــەر کـــارێ لـــەلات ڕێکـــو جـــوانبی
بیکـــە بـــا خۆشـــنوودەی نـــاو دڵانبـــی

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٩

## ڕێزداری

چـــەند تەمـــەن زۆر بـــێ ڕێـــزی پێوەیـــە
چـــەند زمـــان تونـــدبی، جـــوانی پێوەیـــە
چـــونکە بێـــدەنگی جـــوانی مرۆڤـــە
لای نـــەزان ڕێـــزدار، جوانیـــو شـــێوەیە

هەولێر
٢٠١٦/٧/٢٣-٢٢

## کردەوەی باش

پـــێش ئەنجامـــدانی کـــار بـــیر بکـــەوە
تـــا هەڵـــەت کـــەم بـــێ نـــەڵێن لەخـــەوە
کـــارت لـــەجێ بـــێ، (خـــودا) و بەنـــدەکان
خۆشـــــیان ئـــــەوێیو دوا ناکەویـــــەوە

هەولێر
٢٠١٩/٣/٣

## کەسووکار

کەسووکاریشـــبێ کـــە هـــەر خۆیبـــوێ
دڵڕەشـــوو دووڕوو بـــێ، تـــۆ مەتـــەوێ
کەســـێ لەگـــەڵتا دڵـــی پـــاك نـــەبێ
زوو بـــەلاوەینێ، بـــا لێـــت دوورکـــەوێ

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٠

## ڕێی چەوت

مـــــەڕۆ بەڕێگـــــەی تـــــاریکو چـــــەوت
نـــەك گاڵتـــەت پێکـــەن بڵـــێن وا خـــەوت
ڕێـــز لـــەبێڕێزان مـــەڵێ پێـــت ئـــەڵێم
بـــا نـــەڵێن بـــەدوای ڕێـــی گـــومڕا کـــەوت

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٦

## کردار شیرین بە

کـــــردار شــــیرین بـــــە تــــا پێبکــــەنی
دڵشــــاد و گـــــەش بـــــە بــــا دڵبخـــەنی
خـــۆت بکـــە چـــاوو دڵــــی هـــەموو کـــەس
نەکبـــــــەدبی دڵان بکـــــــەی بۆگـــــــەنی

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٦

## ڕێز

ڕێـــــز لەکەســـــانی خۆپەرســـــت مــــەگرە
ڕێزیشـــــت لێنــــان پێــــی لێهەڵمــــەبڕە
چـــونکە زۆر کـــەس هـــەن لـــەخۆبایی نـــە
لەهەڵـــــــــەکانت، دەرس وەربگــــــــــرە

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢

## لووت بەرزی

کەدیتتیـــەکێ خـــۆی لێـــت نزیککـــرد
لای نزیـــک بــــەوە، زو بەدەســــتو بـــرد
هـــەرکاتێ هەســــتت کـــرد بــــەلاوەی نــــای
مەبـــــە بەپشــــت و بۆیمەبـــــە بــــەپرد

هەولێر
٢٠١٥/٤/٣

## ڕاز

ڕازی خـــۆت لــــەکن کــەس، هەڵمەڕێـــژە
کەســــێ وابکـــا بــــێ توانــــا و هێـــزە
ڕازی دڵ ڕاگـــــرە، تـــــا بــــاجی نـــــەدەی
گــــەر خـــــۆڕاگر بـــــی، ســــەنگت بــــەپێزە

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٥

## خۆ سەپاندن

خـــــۆ مەســـــەپێنە بەســـــەر ئـــــەمو ئـــــەو
بـــا خۆشـــــی ژینـــــت، لێ نـــــەبێ بەشـــــەو
بەرامبــــەر کۆمـــــەڵ، بـــــا ڕیســـــوا نـــــەبی
بـــــەزۆر خۆتمەکـــــە پێشـــــەنگو پێشـــــڕەو

هەولێر
٢٠١٥/٦/٣

## کەسی ناشایستە

ناشایســــــتەتدی، تـــــۆ پـــــێی هەڵمـــــەڵێ
گــــەر پــــێی هـــەڵ بڵێـــی ئـــەگرێ گێچـــەڵێ
پـــــێی مـــــەڵێ مامـــــە یـــــا بەڕێزەکـــــەم
یـــا گـــویێ ڕاگریـــو پـــــێی بڵـــێی بـــەڵێ

هەولێر
٢٠١٥/٦/٧

## چاكە و خراپە

چــەند چــاكەت هــەبێ كــەس باســی ناكــا
بــــەلام خراپەیـــــەك، گشــــتی ڕەش ئــــەكا
كەواتــــە دروشمــــت هــــەر چــــاكە بــــێ
خراپــــە جێپەنجــــەت زو ئاشــــكرا ئــــەكا

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٣

## خۆ هەڵكێشان

بــــەباوكو بــــاپیر خــــۆت هەڵمەكێشــــە
خۆتبپــــــارێزە، بــــــەبێ سەرئێشــــــە
خــۆت چ بــی ئــەوەی ئــەوان بــەتۆ چــی
بــۆ خــۆت تووشــئەكەی بــەمكار و كێشــە

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٤

## کەسێکی قەرپ

یـــــەکێ قـــــەرپ بـــــو خـــــۆتی لێ مــــــەدە
بـــــەهیچ بارێکـــــا پشـــــووی پـــــێ مــــــەدە
بـــــۆی نـــــەرم مەبـــــە چـــــونکە زۆر بـــــەدە
بـــــا لێـــــت نەبێتـــــە ڕێگـــــر و چـــــەتە

هەولێر
٢٠١٥/٧/٨

## ڕێزداری بەکردەوە

چـــــەندی لات ســـــووك بم لام ســـــووکتر ئـــــەبی
چـــــەند ســـــەنگم پـــــێ دەی ســـــەنگین تـــــر ئـــــەبی
چـــــەند لات یـــــەکماڵ بم یـــــەکماڵتر ئـــــەبی
چـــــەند جـــــوانبم لـــــەلات لام جـــــوانتر ئـــــەبی
بیســـــتوومە دونیـــــا لـــــەبۆ دونیایـــــە
چـــــۆنم ببینـــــی لای منـــــیش وایـــــە
دڵســـــۆزبی لـــــەبۆم دڵســـــۆزتر ئـــــەبم
بەســـــۆز بیلـــــە بـــــۆم بەســـــۆزتر ئـــــەبم

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٦

## نهێن پارێز بە

قسە بۆ هیچ کەس مەکە ئەکەوێ
قسەکەر هیچ کات کەسێ نایەوێ
هەرکاتێ کەوا سەربەرزیت ئەوێ
نهێن پارێز بە خەڵك تۆی ئەوێ

هەولێر
٢٠١٥/٩/٢

## ماڵی ئەمو ئەو

پیاو بەماڵ خەڵکا پیاوەتی ناکا
ئەگەر واش بکا هیچ بەهیچ ناکا
ئەم خوە هەردەم لەپیاوا دوورە
کەماڵی ئەمو ئەو بەبەر با دا

هەولێر
٢٠١٥/١٠/٦

## ئاو

لەسەر زێش بڕژی ئاو خەسار مەکە
بەکاری بێنە و خۆت لاسار مەکە
چەندت ئەوێتن هەندە بخە کار
ئەرکێکی قورس لەخۆ بار مەکە

هەولێر
٢٠١٥/١٢/٢٥

## پەشیمانی

هـــیچ کـــارێ مەکـــە لێـــی پەشـــیمانبی

بـــەرد لەکـــەس مـــەدە جـــێی داخـــو ژانبـــی

ڕەفتـــاری جوانـــت خۆشـــی ژیـــانبی

کـــرداری باشـــت لـــەپێش دوانبـــی

لـــەبۆ راســـتگۆیی، هـــەر پەرێشـــانبی

بـــۆ هـــەموو کەســـێك دووری زیـــانبی

ڕاســـتیت ئـــالاّ بـــێ، نـــەك لـــەگۆڕانبی

بـــۆ ڕێنمـــایی ڕاســـت هـــەر شـــان بەشـــانبی

پێشـــبڕکێی چـــاکە، بـــۆت تێڕوانبـــی

پارێزیـــت هـــەردەم، لـــەتیر و تـــانبی

هەولێر

٢٠١٧/١/٢٥

# گوێ بگرە

لەســــەر پیـــاوەتی و چـــاکە بازمــــەدە
قســــە و ڕازی خـــۆت، بـــەهیچ کەسمـــەدە
خــۆت خۆشــنوودە کــە و، ڕێی بەدیشــمەدە
ڕووی گەشـــت، بـــەڕووکراوان هەرمــــەدە
کەســــێکی دۆســــتی بـــەدان بێبـــەدە
خـــۆت مەینـــە ڕێـــزی ڕێگـــر و چـــەتە
تـــــەنیا دەســــت لـــــەماڵێ بدەهەتــــە
دەنـــا جەســــتەکەت ئەســـیری پەتـــە
چـــــی وتم وابـــــە بـــــڕۆ لەمخەتـــــە
بارمتــــــەی دەروونتــــــەوە جەســـــتەتە

هەولێر

٢٠١٧/١/٩

## بەردێ بهاوێ

بەردێ بهاوێ پێت نەکەوتەوە
قسەیەك بكە خۆت نەگرتەوە
هەرکەسێ داری بەر بڕتەوە
لەلیستی ئەمەك خۆی ئەسڕتەوە
لەکۆتا ئەنجام لەبەری ئەخۆی
لەچاوت دابێو، لەیاد نەچتەوە
ئەوەی تێناگا لەدڵیاشەوە
ڕەش بینە، کار ئاڵۆزە، لەخەوە
هۆشت پێشەنگ بێ لەهەڵوێستتدا
رەش لەگەڵ سپی لێك جیاکەیتەوە
ژیان سەرکەوتن، وەتێ کەوتنە
مام ناوەندی بە، هەر ئەمە هەوە
لەسەرکەوتنا سوپاسی (خوا) کە
پێ ئاسوودە بە و، کارت پێشڕەوە
دواش کەوی ڕەشبین، خۆ نیشان مەدە
کەسیەتی و خودی خۆت بەرز کەوە
(خوا) بەندەکی وای، لا خۆشەویستە
ڕاستی ڕێڕەوی بێ وەبۆ نەوە
لەخۆت مەگۆڕێ لەهیچ بارێکا
بێ ورەش مەبە، وەدوا مەکەوە

هەولێر
٢٠١٧/١/٢١

## من ئەڵێم

كاتـــێ كـــەمن پێـــت ئـــەڵێم بـــرای بـــابم
بـــــەزوبانی حــــــاڵ ئەتكەمـــــــە مـــــامم
كەواتـــــە منـــــیش هـــــەر لەشـــــوێنی تـــــۆم
ئـــەبێ بـــاش بـــی بـــۆم كـــەمن بـــۆت چـــابم
كەواتــە بــۆ یــەك بــا ئاشــنا و دۆســت بــین
خۆشەویســـت بـــین بـــۆ یـــەكتر تـــا مـــابم
ســـەروەرمان فـــەرمووی قســـەی خـــۆش خێـــرە
دەبـــــا لـــــــەلاتان بـــــــەرز و بـــــــالاّ بم

هەولێر
٢٠١٧/٥/١٥

# چاکەکار بە

کەســـێکی کـــەوا چـــی لـــەدەس نایـــە
لەچـــاکە دوورە ســـــووکو ڕیســـــوایە
کـــردەوەت ڕێـــزت بـــۆ دیـــار ئـــەخا
بـێ بەرهـــەم بـی کـــەس تـۆی بـەبیر نایـــە
کەســـێکی ســـوودی بـــۆ خۆیـــو خـــەڵکان
هـــەبێ هـــەموو کـــەس پێیـــان برایـــە
ئەنـــدامی بەســـــوود لـــەناو کۆمەڵـــدا
لایـــان بـــــەڕێزە لەبـــــەرزی پایـــــە
دەتـــۆش پێشـــبڕکێ بکـــە لـــەم بـــوارە
یـا گــەر کـار قورســیش بـی بڵـێ سـانایە
بـــەکردەوەی بـــاش دڵ هەنـــد خـــۆش ئـــەبی
وا دێیتـــە بەرچـــاو هـــەر بـــەیاد نایـــە!
ئەمـــــە لەلایـــــەك لەلایـــــەکی تـــــر
لــەلای (خــوای گــەورە) پێــت ئــەدرێ پایــە
هەرکەســێ لــەلای (خــوا) خۆشەویســت بــێ
لای هـــەموو کەســـیش بڵنـــد و بالآیـــە
(گـــــەورەیی خـــــودا) ڕادەبـــــەدەرە
هەرچـــــەندی بڵێـــــی بەبێکۆتایـــــە

هەولێر

٢٠١٧/٦/٧

## بەمستە ئاوێ

بەمســــــتە ئـــــاوێ مەكـــــەوە مەلــــــە
خــــۆت مەدۆڕێنــــە لەئـــــەنجام هەڵــــە
پێشـــــڕەوە ئەمـــــەی چـــاوەڕێی هەلـــــە
كەشــــێوای ئــــەڵێن مەنجـــــەری پەلـــــە
كەواتـــــــە گۆپـــــــارت لێ گێچـــــــەڵە
فڕێیبـــــدەی دیـــــارە قاچـــێكت شــــەلە
قاچیش كەشـەل بـو بـەس هـۆش پێشـەنگ بـێ
لــــەلای هـــــەمووما ن ئــــەم پیـــاوە كەڵــــە
كەســــێ كـــــەم بــــژی بــــەلاّم كــــەڵ بــــژی
ئــــەم پیــــاوە مـــــەردە دووری گێچــــەڵە
بفـــــڕی بـــــەرز بــــی قـــــەبارە بچـــــووك
– ئـــــەبی لەپێشچـــاو بـــەس فــــێڵ و تەڵــــە

هەولێر
٢٠١٧/٧/٨

## قسەی ئەمانەت

قســـــــە گـــــەورەترین ئەمانەتــــــە بــــۆت
زمــــــانی پێــــــوە بگــــــری ڕێـــــزە بــــۆت
قســـــە و شـــــتی تـــــر جیــــاوازی نیـــــە
ڕازی دڵ نــــــــەدەی بـــــــەزمانی خــــــۆت

هەولێر
٢٠١٧/٨/١

# پێشبڕکێ بکە

پێشـــــبڕکێ لەخۆشـــــبوون و لەچـــــاکە
ئەنجامـــــدە فـــــەرمانی (خـــــودای تاکـــــە)
بـــژی ئـــەم کەســـەی لـــەبۆ خـــۆی ئـــەژی
ڕێـــزدار پـــێی ئـــەڵێ مامـــە وە کاکـــە
بـــەڵام هـــەرکاتێ بـــۆ خـــەڵکی بـــژی
بـــێ ڕێـــزی، ســـووکی، بـــڕۆوە ڕاکـــە
کەواتـــە لەنگـــەر لـــەبۆ کەســـیەتیت
ڕابگـــرە و مەشـــێوێ وەهـــەر واکـــە
ئـــەم کەســـەی کـــەوا خـــۆی نـــەدۆڕێنێ
لـــەلای هـــەموو کـــەس، جوانـــە وەپاکـــە
(خـــوا) پـــەنامان دا و بمانپـــارێزێ
(خـــوا) بەتوانایـــەوە زۆر بـــێ باکـــە
(خـــودا) پێـــی خۆشـــە ســـەرمان بـــەرز بـــێ
جەســـتەکەت هـــی تـــۆ نیـــە، هـــی خاکـــە
ئێســـتا پـــەروەردەی بکـــە بـــەخۆراك
مـــردی هـــەر خـــۆراکی ئـــەوی... چـــاکە!

هەولێر
٢٠١٧/٧/١٢

## کەیادم ئەکەی

کەیادم ئەکەی منیش بۆت وامە
بو بەشاهیدم نووکەکەی خامە
کەدەستم ئەگری من دەستی تۆمە
باش بی من باشم قسەم وەلامە
دڵسۆزی خۆمت بۆ بەیان ئەکەم
تا دڵنەوابی بەم چێژو تامە
خۆشە پەیوەندی بەدوو لایەن بێ
نەك یەك ئەنجامی ببێ نەدامە
کەسێ کەسوورە و ڕشتە لەکاری
سەربەرزە.. لای ژیر خاڵە وەمامە
تۆ چاکەکار بی چیتە لەوەی کە
خراپەکارچۆنە شکست ئەنجامە
خراپە هیچ کاتێ نابتە ئەنجامی
چاکە و پیاوەتی گۆتەم بۆ (خوامە)
پیاوە ئەم کەسەی خراپە بەچاکە
وەڵام ئەداتن، لەدوا ئاکامە

هەولێر
٢٠١٧/٤/٣٠

## بەرامبەر خۆتا

کـــــەو ئـــــەبێ بەرامبـــــەر کـــــەو بخوێنـــــێ
ئەگـــــەر وانـــــەبێ چـــــی لـــــەبۆ دێنـــــێ
توانـــــای شـــــێر وەڕێـــــوی زۆر لێـــــك دوورن
شـــێر شـــەڕ ئـــەکا لەگـــەڵیا شکســـت دێنـــێ
گشـــتمان ئـــەزانین شـــێر زاڵـــە بەســـەر
ڕێـــوی بـــێ توانـــا، چـــی بـــۆ شـــێر دێنـــێ!
کەســـی بـــێ توانـــا بەرامبـــەرت هـــات
کـــەڕێزت لێ نـــا، ڕێـــزت بـــۆ دێنـــێ
کاتـــێ کـــەتوانا و هێزیشـــت هـــەبێ
لێبـــوردەبی ڕێـــز لـــەبۆت ئەچـــێنێ

هەولێر
٢٠١٧/٨/١٥

## خۆت بەدیار مەخە

خـــۆت هەڵمەکێشـــە بــــەڕابردوو کــــۆن
ئـــەوەی کــــەڕووی دا نایەتـــەوە، چـــۆن؟
پیـــاو ئـــەم کەســـەیە، کەئێســـتا چ بـــێ
تـــۆ هـــەر ئـــەم کەســـەی، بکـــە شـــەونخون
شـــەوڕۆ بـــە، تـــاکو هـــەر دوانەکـــەوی
ئـــاگر خۆشمەکـــە بەکەونـــە کـــای کـــۆن
چـــیت بـــۆ ئـــەهێنێ کەچـــاو لەدەســـت بـــی
بەخشـــەر باشـــترە لەچاوشـــۆڕ و مـــۆن

هەولێر
٢٠١٧/٨/١٣

## ئەوەی ئیمڕۆکە

ئـــەوەی ئیمڕۆکـــە تـــۆ دەری دەکـــەی
ڕۆژێ دێ بەدیـــدەی ئـــەڵێی ئۆخـــەی
زمـــان و کـــارت ئـــەبێ هاوســـەنگ بـــن
وچـــان و بـــوردن لـــەدەس خـــۆ نـــەدەی

هەولێر
٢٠١٧/١/٢٢

**قال النبی محمد (ص) (مَنْ خافَ شیئاُ فَقَد نالَهُ)**
**واته: لەچ بترسێی توووش ئەبی**

## گەشبین بە

پەنـــــدێکی کـــــۆنم بـــــەبیر دێتـــــەوە
زەرەر لـــــــەنیوەی بگەڕێتـــــــەوە
لـــەکارەکانت نەکـــــەی ڕەشـــــبین بــــی
دڵ چـــۆن تـــێ ڕوانـــی دێتـــە ڕێتـــەوە
گەشـــــبینی جموجۆڵـــــت پـــێ ئـــــەدا
لـــــەدوا ئـــــەنجاما گـــــەش ئەبیتـــــەوە
راســـــپاردەی (ســــاڕێژ) لـــەبۆت ئەوەیـــە
بـــیر لـــەکۆن نەکـــەی گـــەنجی دێتـــەوە
مەبەســـــــتم لەمـــــەش ئەمەیـــــە ڕاڕا
- ببـــــی ناخۆشـــــیت لـــــەبۆ دێتـــــەوە
کەواتـــە هـــــەردەم دووربـــە پێـــت ئـــەڵێم
- لەڕەشـــــــبینیدا بـــــا دوور بیتـــــەوە
چـــــــونکە ڕاڕای و ڕەشـــــبینی لـــــەژین
- ئەشـــــکەنجەت لـــــەبۆ ئەهێنێتـــــەوە
(خـــوا) یـــاربی چـــەندی کەبەختـــەوەر بـــی
- وابـــی هـــەر خۆشـــی دێتـــە ڕێتـــەوە
گەشـــبین بـــە تـــاکو هـــەر ئاســـوودەبی
بـــــەبۆنی گـــــولا مەســـــت ببیتـــــەوە
هـــۆی چ بـــو بـــۆنی گـــوڵ مەســـتی کـــردی؟

گوڵـــــت چـــــاند گـــــوڵیش ئەدرویتـــــەوە
جــۆری تــۆی چــاندراو بــەری وەك خــۆیتی
بەریشـــــیدا بـــــۆت کـــــۆ ئەبێتـــــەوە
ئەگـــەر نـــەتوانی بەســـەر چـــیا کـــەوی
ژینـــــــت لـــــــەقوڵتا زوو ئەبڕێتـــــــەوە
کەواتـــــە ئـــــالآت هـــــەولو کۆششـــــبێ
تـــــا ئەنجامەکـــــەت بەدەســـــت بێتـــــەوە

هەولێر
٢٠١٧/٨/٢١

## سەری بەرزت

ســـەری بـــەرزت بپـــارێزە لـــەکار و کـــردەوە و پیشـــەت
زمانــت بگــرە تــا دووربــی لــەوەی نەبیــە ئەســیری پــەت
بەهاوڕێزت نەوەك هەر هەوڵە خۆش گوفتاریشە و هیممەتە
کەواتــە هــەر لەکۆشــش بــە نــەوەك دەربــێ ڕەگــو ڕیشــەت

هەولێر
٢٠١٧/١٠/٤

## لەپێش کارکردن

پـــــێش وەی بتـــــەوێ کـــــارێ ئەنجامـــــدەی
ئـــــەبێ بـــــەبیرت بـــــەخۆت پـــــەیمان دەی
کەهـــــەنگاوی ڕاســـــت لـــــەبۆی وەلآمـــــدەی
نـــــەك چـــــێژی دڵـــــت بـــــەتامی زامـــــدەی

هەولێر
٢٠١٧/١٠/٢

## لەناو کۆمەڵدا

لـــــەناو کۆمەڵـــــدا تـــــاکو ســـــەنگینبی
ئـــــەبێ باغـــــەرت گـــــەورە و بـــــەرینبی
ئـــــەڵێم دوانـــــت ئـــــەبێ شـــــیرینبی
لـــــەپێناو چـــــاکەش گەرمـــــە برینبـــــی

٢٠١٧/٩/٢٨

## کەچێشتت لێنا

کەچێشـــــتت لێنـــــا ئـــــەبێ بزانـــــی
کەرســـــتەت چـــــیە، نـــــەك بەنـــــەزانی
تـــــا کابـــــان نەچـــــێژێ پەشـــــیمانی
پێویســـــتە ورد بـــــی هـــــەتا ئـــــەتوانی

هەولێر
٢٠١٧/٩/٢٨

**قال النبي محمد (ص): (من حسن اسلام المرء تركه ما لا يعنيه) صدق رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم.**

## خۆت هەڵمەقوتێنە

**نەکەی قسەی کەس ڕاکێشیە بەر خۆت**
**لەدەستی نەدەی کەسیەتیەکەی خۆت**
**ئەوەی کەسووکت ئەکا ئەمەیە**
**قسەیەك بکەی پەیوەست نەبی بۆت**
**بەلاَم هەر گۆتەك کەلەجێی خۆی بێ**
**پێی دیار ئەبی، نەیدەی لەدەست خۆت**

**هەولێر**
**٢٠١٧/٩/٢٨**

## بەپێ توند بگرە

**بەپێ توند بگرە، بێ پێ ئی خۆتە**
**بەپێ لەدەس دەی، دڵتەنگی بۆتە**
**ئەسپێ کە چا بێ، خۆراکی زۆرە**
**هەوڵی بۆ بدە، تا لەدەس خۆتە**

**هەولێر**
**٢٠١٧/٩/٢٥**

## پێچەوانەیی

**تا ماڵخۆ دزیگرت، دز ماڵخۆی گرت!**
**لێ ی دا و شکستی کرد و ڕێی لێ گرت**
**نەزان ناڕەوای زۆر پێ ڕەوایە**
**بۆ بەدکار مەبە، بەپەنا وەپرد**

**هەولێر**
**٢٠١٧/١٠/٨**

# گوێم لەبۆ شلکە

هـــەر قســـەك بـــەبیر هـــات مـــەی درکێنـــە
یـــەکێ قســـەی کـــرد قســـەی مەبڕێنـــە
مـــەڵێ پـــڕ هیـــوای دڵان مەفڕێنـــە
پیلانـــی بـــەدکار بەئـــەنجام مێنـــە
قســـەی نالـــەبار هـــەر مەســـەلمێنە
کەســـێ دووڕوو بـــو هـــەر مەیدوێنـــە
پـــەیمان و قســـەت بەئـــەنجام بێنـــە
واز لـــەگفتوگۆی ناشـــیرین بێنـــە
دوو کـــەس پێکـــەوەن وازیـــان لێ بێنـــە
گوێیـــان لێ مـــەگرە و تـــۆ مـــەڵێ کێنـــە
رێـــز بـــدە کەســـێ خـــاوەن بەڵێنـــە
دۆســـت مەبـــە بـــۆ وانـــەی دەســـت و پێنـــە
واز لەدەســـت پـــان کردنەوەشـــا بێنـــە
دەســـت و بـــازووی خـــۆت بەکاربهێنـــە
چـــاڵ بـــۆ هـــیچ کەســـێ هەڵمەقەنێنـــە
رازی نـــاو دڵـــی خـــەڵك دەرمەهێنـــە
نـــامۆی بەدڕەوشـــت ئـــەکا وڕێنـــە
بـــۆ کـــەس نایـــەوێن؟ بـــەدیان لەڕێنـــە
ڕەســـەن کەســـێکە لـــەکار ڕەســـەن بـــێ
مـــەڵێ لـــەکاران ئـــەو خۆســـەپێنە
ئامۆژگـــاری (ســـاڕێژ) بـــۆت بەڵێنـــە
بەئـــەنجامیان دەی لـــەبۆت هەوێنـــە

هەولێر ٢٠١٧/١٠/٨

# قسە گێڕانەوە

فیتنە کێکردی؟ قسە گێڕەوه
قسەی خۆت وەخەڵکان مەگێڕەوه
پیاو بە خۆت مەکە پەندی سەر زاران
نهێنیت توندبێ بۆم هەر لێرەوه
ئەم خوه پیسە فەرامۆش بکە
با نەکەویە کەند لەم هەردێرەوه
(ساڕێژ) پێت ئەڵێ پابەند بە بەمە
تاکو وەکو پیاو ببیە بوێرەوه
قسەی ئەمو ئەو بەیەك مەگەینە
ڕازی دڵ مەدە زار لەم سێرەوه
سێرەت لەکەسێ داگرت بەکوشتن
مەی کوژه، چەکت زو بشێرەوه
پیشەی نامەردان مەکە بەهی خۆت
وازبهێنە لێی لەڕێی خێرەوه
پیاو بە خۆت بێنە ئاستی شێرەوه
مەمینێ وەکو سەگی دێرەوه
کەسێ پیشەیتی قسە گێڕەوه
کاوێژێ ئەکا وەکو چێرەوه
کەسێ پیاو نەبێ چوار پێی جارانە
ئەم کەرە لەناو قوڕ بگێڕەوه

هەولێر
٢٠١٧/٦/١٦

# مردن

هەر (خوا) ئەزانێ کەچەند پەنهانە
واتای ئەم کۆچە کۆتای ژیانە
رۆژێکی وایە ژینت نەمانە
خۆزی نابەی بۆی لەبەر دلانە
لێکی دەیەوە تیغی دەیانە
ئەتبڕێ و کۆتا بەتۆ هێنانە
ئەوی تێ بگا بۆی پەرێشانە!
لەپێش چاوی کوێ قەشەنگە...! جوانە...!
دڵشادی جێگەت نەرمو نیانە
کەیەقەی گرتی لەشت بەژانە
بڕوانە کەوا تۆ لەم جیهانە
مەست و دڵخۆشی بەم نانو خوانە
بەم نانو خوانەی هەتە ڕۆژانە
کەسێ دڵگەش بێ پێیا نەزانە
کوڕنوشێ بۆ خوا بەرە بەیانە
گەر نەیکەی.. گیانت تاریکستانە
کۆتایی ژیانت هەر گۆڕستانە
بەلکە بیگەیەی هەر بەم زوانە
شێرە ئەم کەسەی (خوای) پشتیوانە
هەر خۆیو گیانی لەخڵوەدانە
خڵوەکی وایە جێی سەرسوڕمانە
بەڵام ون نابێ لای (خوا) بزانە
بەڵام پێت بڵێم دەردێکی گرانە
زەخیرەت نەبی دڵ پەشیمانە
لەکەسێ نەگری تیرێ وەتانە
کۆتای ژیانت ئاخیر زەمانە

هەولێر ٢٠١٨/١٠/٢٠

## هەڵوێستی کەرێ

هەڵوێســـــتی کـــــەرێ چــــی لێدەرئەچـــــێ
نیســـــــك کەهەڵچـــــــو زۆر زو هەڵئەچـــــــێ
گـــــەر تـــــۆ دانــــابی خـــــۆت دەربـــــاز ئەکــــەی
پێداچــــی لەگـــــەڵیا چـــــی دەرئەچـــــێ......!!

هەولێر
٢٠١٨/١٠/٢١

## ئامۆژگاری

## هەڵوێستی شیرین

لەگشـــــت ڕەوشـــــێکا تـــــا دوور بـــــی لـــــەزەڕ
عقـــــل بخـــــە گـــــەڕ تـــــا لێ ی بخـــــۆی بـــــەر
مـــــار بەقســـــەی خـــــۆش لـــــەکون دێتـــــە دەر
ئـــــــــەگینا وەك ســـــــــەگ ئـــــــــەکا وەڕە وەڕ
زانـــــــــابی، دووری لـــــــــەئاژاوە و شـــــــــەڕ
هەڵوێســـــت شـــــیرینبی شـــــێرئەبێ بەمـــــەڕ!

هەولێر
٢٠١٨/١٢/٥ چوارشەممە

## ڕێز

ڕێـــز بـــده کەســـێ کـــه پێبزانـــێ
ئەگـــەر وانەکـــەی گـــەڵێ نـــەزانی
ئەمەکـــدار ڕێـــزی بەرامبـــەر ئـــەگرێ
پیـــاو ئـــەبێ هـــیچ کـــەس بەکـــەم نـــەزانێ

هەولێر
٢٠١٨/١٢/٢٠ پێنج شەممە

## ئامۆژگاریم

گـــوێ لـــە دوانم بگـــره لـــەم گۆشـــە
دوو قســـان بکـــڕە قســـەك بفرۆشـــە
بـــێ لێکدانـــەوە قســـان مەبێـــژە
هەرکەســـێ وابـــێ گێـــل و بـــێ هۆشـــە
بڕوانـــە (ســـاڕێژ) بـــۆت جگەرگۆشـــە
ســـەنگت زمانتـــە بـــۆی تـــێ بکۆشـــە
گشـــت قەدەغـــەکراو ڕەواجـــی هەیـــە
ڕەســـەن گـــوێگرە ئامـــاژەی خۆشـــە

هەولێر
٢٠١٩/١/٢٥ هەینی

## قسەی بێ ئەنجام

قســـەیەك نەکـــەی ئـــەنجامی نـــەدەی
ئـــەگینا متمانـــە لەدەســـت ئـــەدەی
نەکـــەی درۆ بکـــەی کەســـایەتیەکەت
بـــەهای نامینـــێ، چـــی بەچـــی ئەکـــەی..؟!

هەولێر
٢٠١٩/١/٢٩ سێ شەممە

## پێدا مەچو

لەگـــەڵ ناڕەســـــەن هـــــەر پێـــدا مەچـــو
قســـەی خـــۆش تاڵـــە لای کاتـــێ هەڵچـــو
وات ئەشـــــــێوێنێ نـــــــاوت لەبیرچـــــــێ
کـــار لــــەکار تـــرازا، وا لەدەســــتت چـــو

هەولێر
٢٠١٩/٣/٢ شەممە

## ئارامگر بە

هــــەر کــــارێ لــــەژین ئــــەنجامی بــــدەی
نەکــەی پەلــە کــەی، لەدەســت خــۆی بــدەی
پشــــت لــــەهێمنی و ئــــارام، بەرنــــەدەی
تــا کەســـیەتی و هێـــز، لەدەســـتت نـــەدەی

هەولێر
٢٠١٩/٣/١٨ دووشەممە

## هونەری ئەدەب

هونـــــەری ئـــــەدەب لــــــەلام شــــــیرینە
هـــەر بێـــزار نـــابم پـــێم چەشـــەی ژینـــە
خـــــۆراکی باشــــــە، بــــــۆ زاخـــــاوی بــــــیر
هێـــــــزی ئـــــەداتێ بــــــەتوانا و تینـــــــە

ئوردن- عمان
٢٠١٦/٦/١٥

## قوربان

قوربـــــــان (ســــــاڕێژی) دەردی گــــــــرانم
بکـــــــە لـــــــەبۆما بـــــــۆت پەرێشــــــانم
ببــــــە بەکەســــــو بەپشــــــتو شــــــانم
ببــــــە بەخونچــــــە و گــــــوڵ و ڕەیحــــــانم
خـــــوا بیکـــــا لـــــەبۆم تـــــاکو نـــــەمانم
شـــــەربەتی مـــــن بـــــی، چـــــێژی زمـــــانم
چەشـــــــەت لێ ئەکـــــــەم خۆشـــــــی ژیـــــانم
ئـــــاو چـــــۆنە بـــــۆ دار پێـــــت لـــــەڕوانم
ئاوێنەبـــــــە بـــــــۆم تـــــــاکو بتـــــــوانم
خـــــۆم تـــــێ ببیـــــنم مـــــاوەی ژیـــــانم
دلشـــــــادم کـــــــەوا کاتـــــــێ بـــــــزانم
لەگلســــــــتانت گـــــــــوڵێکی جـــــــــوانم
ئـــــــاوێزانم بـــــــی، بـــــــۆت ئـــــــاوێزانم

ســـــــۆزت لـــــــەبۆما خۆشـــــــیمە خــــــانم
بیــــــانۆم پێمــــــەگرە مەســــــتم حـــــەیرانم
کەشـــــــــیرینم لات مـــــــــن پێئـــــــــەزانم
گـــــولی کــــــونجی دڵ پێـــــت وتم جــــوانم
گـــــــولێکی شـــــــەنگی لەگلســـــــتانم
قەشـــەنگترین گـــوڵ تـــۆی هـــەردوو چـــاوم
مەســـــــتم لـــــــە بۆتــــــا لاوی پێـــــت لاوم
شــــــوان گۆشــــــەگیرە لەدەشـــــتی پانــــــا
لەگەشـــــــتی دڵمــــــا نـــــــەما ئـــــــەمانم

هەولێر

٢٠١٧/٧/١٧

# مەتەڵی یەکەم

## (١)مەتەڵ

پێی هاتمە مەیدان بۆ تیماری برین

تیماری زامی، بەئێشی بەتین

دەست بەردار نابین، بێهیوا نابین

بۆ چارەسەری، هەموو دەردی ژین

خۆشحاڵە (ساپێژ) (خوا) ئەوی پێدا

تا گەل سەرکەوێ، لەزانست، ئایین

مامۆستایە بۆم، چرایە بۆ بینین

پێ هەنگاو ئەنێم، بۆم ئەبتە ڕێبین

نەخشەی ژیانم کردەوە و گرێی

ناو دڵ ئەڕێژم، بەدەمی شیرین

هەردەم لەبۆما، ڕێزدارە چرایە

تاکو ئەم ڕۆژەی ئەچمەوە زەمین

سەهۆڵە لەبۆم دڵم تا بگرێ

کەلەرزی بێتی بۆی ئەبتە هاوین

لەرز و تای لەبۆ سارد ئەکاتەوە

جوانە وەك بوکی قەشەنگی سەر زین

بۆم ئەبتە قەڵغان بەرامبەر دوژمن

بۆم ئەبتە پەنا، هەروەکو کەمین

پێنج پیتە پیتی یەکەم و پێنجەم

لێك بدرێ مناڵ دێتە پێکەنین

مناڵیش پێیا بەپێکەنین دێ

لـــــەجێی تیـــــغ بـــــەکاردێ لـــــەبۆ بـــــڕین
پیتـــــــــــــــــــــــەکان (٣ و ٤ و ٥ و ٢)
کـــۆی کـــەی لەگـــەڵ (ن) ئـــەبێ بەنووســـین
(ســـــارێژ) ئەمـــــــەیان دەســـــــتەواژەیە
پـــــیرۆزە لـــــەلام بـــــۆ ســـــەکۆ بـــــڕین
ســـــەکۆ و گرێـــــی دڵ (خـــــوا) لای ئـــــەباتن
(خـــــوا) مەبەســـــتی بـــــێ هۆکـــــارە لـــــەژین

**مەتەڵەکە: پێنووس**

| پێنووس | پیتی یەکەم | پیتی دووەم | پیتی سێیەم | پیتی چوارەم | پیتی پێنجەم | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| پێنج پیتە | پ | ی | ن | وو | س | |
| پرسیاری دووەم | / + | ی | ن + | وو + | ص | +ن= نووسین |
| پرسیاری یەکەم | پ+ | / | / | /+ | س | =پیس |

**تێبینی**// بتەوێ مناڵێك بەپێکەنین بێنین دەست لەچەنەگەی مناڵەکە بدەو بڵێ پس پس پس مناڵە کە دەست ئەکا بەپێکەنین

هەولێر
٢٠١٦/٩/٣

# مەتەڵی دووەم

## (٢)مەتەڵ

گـــەڵێ شـــیرینە کـــەجێی خـــۆی بگـــرێ
بۆیـــە هـــەموو کـــەس، لـــەبۆیا ئـــەمرێ
چـــەند چـــاوەڕوانی ناخۆشـــە هێشـــتا
بـــەڵام هـــەر خۆشـــە کـــەئامانج بگـــرێ
کـــەئارامت بـــو کـــارت ســـانایە
کـــەکار ســـانابو ژیانـــت جیایـــە
ژینـــــت جیائـــــەبێ لەڕەشـــــبینیدا
دوور ئـــــەبی لـــــەدەردی دەروونیـــــدا
دەبـــا هەوڵـــدەین بـــۆ خۆشـــی ژیـــان
ســـاغ بـــین لەگـــەڵ یـــەك دوور بـــین لـــەزیان
ســـەرەتای پیتـــی دەســـت پێکردنـــی
(کا)یـــە کۆتـــایی (تا)یـــە پـــێ خـــەنی
وردبـــــە و هەڵســـــتە هـــــەڵی بهێنـــــە
بـــــەفیڕۆی مـــــەدە لامـــــان شـــــیرینە
زۆر خۆشەویســـــتە، ئـــــەوەی تێبگـــــا
تـــۆش ڕێـــزی لێنـــێ بڕوانـــە تکـــا
چـــۆن پـــێی هـــەڵبلێم قـــەرزاری ئـــەوم
پشـــــووی بـــــەمن دا تـــــاکو بخـــــەوم
لـــەکار و پیشـــەم بـــرا بـــو لـــەبۆم
نائومێـــد نـــیم لێـــی بـــا بیگـــرم بـــۆ خـــۆم

مـــەرج نیـــە مـــاوە بـــدا بەگشـــت كـــەس
دیـــاری (خودایـــە) كـــەپێی داوم بـــەس
چـــۆن پێـــی هەڵنـــەڵێم نەخشـــەی ژیـــانم
پابەنـــــدە پێیـــــا تـــــاكو نـــــەمانم
بـــێ ئەمـــەك نیمـــە وەپـــێ ئـــەزانم
بـــەم خولیـــا و بـــەهرەی كەئـــەیان زانم
ئـــــەوەی ئـــــەیزانم لەئەســـــتۆمایە
دراون پێمـــــا (دیـــــاری خودایـــــە)
بـــەهرەكانی ژیـــن یـــەكیان لەنووســـین
زۆرن وەچـــین چـــین بەپلـــەن بـــەتین
هـــەروەكو منـــاڵ ئـــەتۆی پێگەیانـــد
تـــا نـــاوت دەركـــرد، زو تـــۆی تێگەیانـــد
بۆیـــە بەپشـــت و پـــەنا و هـــاودەنگی
ئـــەی هونـــەر ئـــەنجام درای بـــەبێ دەنگـــی
هێنامیـــە ســـەر ڕێ، لەبابـــەت هونـــەر
بانگـــــــەوازی وا دڕ زیـــــــانوزەڕ
پـــیرۆزە، (خـــودا)، ســـوێندی پـــێ ئـــەخوا
دە هـــەڵی هێنـــە، مەپرســـە كـــوا؟
ئەم مەتەڵە (كات)ە واتە (الزمن)

ئوردن– عمان
٢٠١٦/٦/١٧

# مەتەڵی سێیەم

## مەتەڵ

کـــۆن نـــابێو، کـــاری خۆشـــی هـــەر ئـــەکا
تـــــا ڕادە گـــــریۆی نـــــاو دڵ دەرئـــــەکا
بـــۆ پیـــاو ســـوودمەندە، بـــۆ ناپیـــاویش زەڕ
داینـــــێ و ئـــــەمینێ، نایەتـــــە کۆتـــــا
لام خۆشەویســـــتە و لای هـــــەموو کەســـــیش
هـــەت بـــێ بەرخۆرتـــە بـــۆ نـــان و دۆتـــا
نـــەی بـــێ، بـــێ ئـــارام، وەچـــاویش لەدەســـت
ئـــــەبێ هـــــەموو دەم دەروونـــــی فـــــەوتا

ئەم مەتەڵە (پارەیە)

هەولێر

٢٠١٧/٧/١٨

# گری دوور

کەسـێ نـەزانبێ تـا لەژیانـە
ئـەڵێ گـری دوور لـەبۆم دەرمانـە
بـۆ وەهـا ئـەڵێ؟ دوژمنـی خـۆیتی
قسـەی جوانیشـی لا دەرد و ژانـە
گـەوجیو نـەزانی لـەلایا مایـە
خـەڵك لەدەسـتی لەداڕمانـە
بۆیـە زانسـت و زانیـاری بکـە
تـاجی سـەر سـەران تـۆ لـەم جیهانـە
ڕێـوی خـۆت مـەدە بەشـێری هـیچ کـەس
هـیچ چـارەت ناکـا کەسـی بێگانـە
خـاکی کوردسـتان دوڕو گەوهـەرە
لـەبۆ پـێی نـادەی سـەنگو متمانـە؟
هـەموودەم زانسـت، لەگـەڵ زانیـاری
دوورت ئـەخاتن لـەتیر و تانـە
زمـانی شـیرین وەڕوێکـی خـۆش
وامـان لێ ئـەکا بڵـێین پشـتمانە
خۆشـیو برایـەتی لەنێوانمانـدا
هێمـای ڕەوشـتی بـەرز و جوانـە
کەواتـە ورد بـە دووربـین بـە ڕۆڵـە
ئـەوەی هـەوێنی ژیـن و نەمانـە
ڕەفتارتـە، لەگـەڵ زمـانێکی خـۆش
لای خـەڵکان تـا تـۆی پـێ دەسـت نیشـانە

چــی تــریش مــەڕۆ بــەدوای کــڵاوی خــوار
بــێ (ســێره) لەکــەس مــەگره نیشــانه
دەرکــەکت لەقانــد دەرکــەت ئەلــەقێ
پیــاوی ســوود بــەخش شــێری مەیدانــە
(ســاڕێژ) پێــت ئــەڵێم بــیرت بخــە کــار
تــا دیــار بــی تەنانــەت لای بێگانــە
هۆشمەنــد بــە لــەپێش ســەرکۆنەکردن
دان بەهەڵــەت نــێ، ئــەڵێن گوڵمانــە
زمــان لــەهیچ کــەس خــراپ مــەبزێوە
تــا هــەر پێــت بڵــێن خــوێنی دڵمانــە
چــەند خۆشــە بێینــە ئــەم ســەنگو پایــە
نــــەڵێن کــــرداری دەرد و زیانـــــە
بەچــاکە دیــاربین لای (خــودا) و بەنــدە
ئــەم کاتــە (خــودا)، پــەنا و، پشــتمانە

هەولێر
٢٠١٦/٨/٣

## لەمازیان

ڕۆژێ لـــــــەمازی ئەگـــــــەر تێکـــــــەوتی
هـــەر خـــۆت دامـــەنێ کـــەوا تـــۆ چـــەوتی
هــــــەرکاتێ ئەگـــــــەر ڕۆژێ تێکـــــەوتی
ئاگـــات لـــەخۆ بـــێ نـــەڕۆی بەچـــەوتی
وەرە لەچینچـــــکان تـــــێی بهێنــــــەوە
ورە بەرنــــــەدەی، ڕاســــتی وەڕەوتـــــی
پێشـــڕەوی بکـــە، تـــا نەکەویـــە کەنـــد
پــــارێزیش بکـــــە لــــەئاوێکی مەنــــد
چـــونکە کەســـانی مەنـــد گشـــت زیندوونـــە
بڕوانـــە پێشـــخۆت، وەریـــش بگـــرە پەنـــد
ژیـــــن ســــــەرکەوتنە، وەتـــــێ کەوتنــــــە
هەڵوێســـتت نـــەبێ ئـــەی چـــەندی بەچـــەند؟

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٢

## دەرقەتت نایەم

دەرقــــــەتت نایــــــەم ڕێـــــزت لێ ئـــــــەنێم
بـــا تـــۆ هـــەر تـــۆ بـــی، ئـــەدی منـــیش کـــێم
بـــۆ کـــاری چـــاکە هـــەر بێگومـــان دێـــم
لێشـــم بڕەنجێـــی هـــەر لـــەم ڕێیـــە دێـــم

هەولێر
٢٠١٦/٨/١

## پێویستکار (مُحتاج)

ئـــەم دەســـت پێویســـتی بـــەوی تـــر نـــەبێ
زەنگینـــــی کـــــەپو بـــــەرز، ئـــــەبێ چ بـــــێ
مــــــەڵێ پێویســــــتکار گــــــەوج و نەزانــــــە
دواڕۆژ نادیــــــــارە، هەریــــــــەکیان بــــــــێ

ئوردن- عمان

٢٠١٦/٦/٢٨

## بەرامبەر میوان

بەرامبـــەر میـــوان ئـــەبێ ڕووخـــۆش بـــی
نـــەککڕ و، کـــەپو، کـــز و، خـــامۆش بـــی
نانەکـــەت جـــۆ بـــێ، چـــی تیانیـــە
خوڵقـــت گـــەنم بـــێ، ئێســـتا بـــەس نیـــە!

ئێران- بۆکان

٢٠١٦/٨/١٧

## پەندەکان

ویســـــتم پەنـــــدەکان تۆمـــــار کەمـــــەوە
لـــــەبیری خـــــۆم و کـــــورد، نـــــەی ســـــڕمەوە
بۆیـــــە کردوومنـــــە، سەرمەشـــــقی ژیـــــنم
نـــــــەوەك لەخـــــــەڵکی وەربگرمـــــــەوە

ئوردن- عمان

٢٠١٦/٦/٢٨

## قسەی بێبەها

کەســـــی نـــــەزان بـــێ بەکـــــەڵك نایــــــە
دووبــــــارەی قســــــەی، لا پووشـــــو کایـــــە
گــــەر قســــە چـــوار بـــێ هــــەر دووی بــــەکارە
ئــــــــــەویتر، لــــــــــەلام زۆر بێبەهایـــــــــە

ئوردن– عمان

٢٠١٦/٦/٣٠

## ماڵی گەش

ئـــــەڵێن مــــاڵی گـــــەش، لــــــەبۆ ڕۆژی ڕەش
کـــەس لـــەزەیی (خـــوا) نابـــێ بـــەبێ بـــەش
مــــــاڵی کـــــۆکراوە– بــــــۆ مــــــاوەکی زۆر
ڕۆژێ دێ خـــــەنیت کـــــا وەك گـــــوڵی گـــــەش

ئێران– بۆکان

٢٠١٦/٨/١٤

## نەمبیستووە

نـــەم بیســـتووکە وە مـــەڕ پـــێ لەبـــەرخی نـــێ
چـــــــونکە لێزانــــــــە، کــــــــەزیان دێنـــــــێ
لێکدانـــــــەوەی وا ســـــــوودی بــــــۆی هەیـــــــە
بەمشـــــێوە، خۆشـــــی بـــــۆ بەدەســـــت دێنـــــێ

ئێران– بۆکان

٢٠١٦/٨/٧

## کەمخواردن

کـــــــەمخواردن، لـــــــەبێ دەســـــــەڵاتیە
نـــــــەبوی زۆر خـــــــوڵا، لەگەمژەییـــــــە
ئـــــــەبێ بەقـــــــەد خـــــــۆ، پێڕابکێشـــــــی
وابکـــــــەی ورەت هـــــــەر لەبەرزیـــــــە

ئێران- تبرێز
٢٠١٦/٧/٣١

## پشکۆ

پشـــــــکۆ لەکوچـــــــك زۆر گـــــــەرمترە
بزانـــــــە پشـــــــکۆ چـــــــیە؟ ئـــــــاگرە
نـــــــەزان تـــــــێ ناگـــــــا، لەبۆیـــــــە شـــــــڕە
بـــــــەدخو لەچـــــــاکە هـــــــەردەم ڕێگـــــــرە

هەولێر
٢٠١٥/٢/٢٢

## کەسێکی کەسە

کەســـــــێکی کەســـــــە، ئـــــــەلفێکی بەســـــــە
کەســـــــێ پیـــــــاو بـــــــێ کەســـــــی گشـــــــت کەســـــــە
کەســـــــی ڕووشـــــــکێن وەڕوو کـــــــراوە
لەخۆشەویســـــــتی کۆمـــــــەڵ بـــــــێ بەشـــــــە

ئوردن
٢٠١٦/٧/١

## تیری بەدڵە

تێـــــری بەدڵــــــە، نــــــەوەکو بــــــەماڵ
کــــەس هەڵمەکێشـــــە بەشـــــان و بــــــەباڵ
ئیفلاســـیش ئەگـــەر، دڵ تێـــر و مەســـت بـــێ
رۆژێ نابینـــــێ ژینـــــی تـــــەنگو تـــــاڵ

هەولێر
٢٠١٦/١٠/٩

## مریشك

مریشـــــك هێلکـــــەی قـــــاز بکـــا بەڕاســـــتی
تـــێ ناگـــا ئـــەڕوا هـــەر بـــەپێ خاوســـی
چـــیت لەئەســـتۆیە هـــــەر هەنـــــدە بـــڕۆ
بــــــەرکت ببینــــــە، وەزێـــــــدە مـــــەڕۆ
مریشـــــك هێلکـــــەی قـــــازی پـــــێ نـــاکرێ
واش بکـــــا زۆر زوو هینەکــــــەی ئـــــەدڕێ
خـــــۆ مەکـــــە گاڵتـــــەجاڕی ئـــــەمو ئـــــەو
وابکـــــەی ڕێـــــزت هـــــەر پـــــێ نـــادرێ

هەولێر
٢٠١٦/١٠/٨

## لەتێکەوتنا

لەتێکـــــــەوتنا پەنـــــــدێ وەرگـــــــرە
بـــــا بڵـــێن فـــــلان وەك گڵپـــــە و گـــــڕە
فــــەرامۆش مەکـــــە هـــــەرگیز لــــەمافت
گوێمــــەدە، کەســـــێ پێـــــت بڵـــێ شــــڕە

هەولێر
٢٠١٥/٤/١٣

## چاکەکار بە

یــــاری بەپشــــکۆی ئـــــاگر نــــاکرێ
پیــــاوی چـــاك بەکــــەس نـــاوی نـــازڕێ
کــــردەوەت بـــاش بـــێ، چـــاکەت دێتـــە ڕێ
خراپـــەکار هـــیچ کـــات جێـــی خـــۆی نـــاگرێ

هەولێر
٢٠١٥/١/١٠

## ڕاستگۆیی

ڕاســـــتگۆ بـــــە درۆزن بەپرتـــــە پرتـــــە
چـــونکە هـــەموو دەم پـــەتی درۆ کورتـــە
ڕاســـــتگۆ پێشـــــەنگە لەهـــــەموو کاتــــێ
قســـــەی ڕەوایـــــە و لـــــەناخی دڵتـــــە

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٩

## کێشکە

چــــۆلەکە خـــۆت هــــەی، چــــەلاوت هــــەبی!
ئەمــــەی دان ئـــەنێ پـــێی، ئـــەبێ چ بـــێ؟
لەدەســــــتووری ژیــــن، پــــێ هەڵمـــــەبڕە
کـــــەپێت هــــەڵبڕی ناشــــیرین ئـــــەبی
کێشـــــکە مــــەلێکی گـــــەلێ بـــێ هێــــزە
بۆیــــە پێــــی ئـــــەڵێن لای کۆمــــەڵ کپــــی

هەولێر
٢٠١٥/٣/١٨

## گوریس

گــــوریس بەیــــەك قــــەد هــــەر نایەتــــەوە
مــەی کــە چــەند قــەدێك، چــۆن هەڵدێتــەوە
شـــتێ پێـــت نـــاکرێ خـــۆتی لێ مــــەدە
کەخۆشــــــــت لێـــــــدا ئەتبڕێتــــــــەوە

هەولێر
٢٠١٥/٣/١٨

## کەرێ لەکن کەر

کــــــەرێ لـــــەکن کـــــەر ببەســــــتیتەوە
بەکـــــەر دەرئەچــــێو، خــــۆی ئەگریتــــەوە
گـــەر خۆشـــی وەك وی نــــەبی خاســــیەتی
زۆر بەتـــــــــەواوی، وەرئەگریتـــــــــەوە

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٦

## کوڕی سەگ

ئـــەڵێن کـــوڕی ســـەگ گـــورگ خنکێنـــە
چـــونکە خـــۆی کـــردە، گـــورگ بەزێنـــە
لەهـــــەموو، هـــــەورێ بـــــاران نابـــــارێ
ئەگـــــەر بشـــــبارێ لات سەرســـــوڕمێنە

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٧

## کەری لاباران

هەرشـــــتێ کەســـــێ لێ ی بـــــو بـــــەبارێ
هیـــــوای ئەوەیـــــە ڕاوەســـــتێ جـــــارێ
تـــــاکو لەکـــــەری، لابـــــاری بارکـــــا
ئـــەرکی خـــۆی ســـووك کـــا و پێیـــا ئـــەناڵێ

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٩

## کەر هەر کەرە

کـــــەر بچـــــتە بەغـــــداش نـــــابێ بـــــەهیتر
هـــــەر کـــــەری جارانـــــە، ئـــــەڵێم... ئـــــیتر
مـــەی کـــە پێشـــەنگی خـــۆت لـــەهیچ کاتـــێ
مـــــەی کـــــە جێگـــــری خۆشـــــت، جـــــاریتر

هەولێر
٢٠١٥/٣/٢٩

## بۆ ریشێ مەچۆ

بۆ ڕیشێ مەچۆ سمێڵیش لەولا
لەبانیا دانێی بکەویە ئەولا
هەموو شت هۆی خۆی بەدواوە هەیە
کارت ساناکە، مەیکەوە جیا

هەولێر
٢٠١٥/٢/١

## خۆر زۆرە

خۆر زۆرە بەڵام ماریش بەئمور
ئەیخوا پێشە خۆی، ئەبینێتن دوور
ماڵت زۆریش بێ بەفیڕۆی مەدە
تا لەلای خەڵکان ببیە خاڵ و پور
ماڵت بۆ خۆتە، ڕێزت لێئەگرن
نەت بێنەویستی دیاری تاڵ و سوور

هەولێر
٢٠١٥/٢/١

## قوڕ بەبێ تۆزە

وەرە با ئێستا بۆت بکەم باسێ
بیستومە کەتۆز لەقوڕ هەڵناسێ
کەسێ نەیەوێ چاکە بکاتن
ڕوی هەر لێ مەنێ با کەس نەناسێ

هەولێر
٢٠١٥/٢/١

## ماڵی قەرب

مـــاڵی قـــەرب گشـــتی زۆر بـــێ بەهایـــە
ســــــەر بەخاوەنیـــــــە و لام نارەوایـــــــە
دڵــــت بـــــەماڵی وەهـــــا خـــــۆش نـــــەبێ
جـــوان و رێکـــیش بـــێ لام پووشـــو کایـــە

هەولێر
٢٠١٥/٢/١

## دەریا

دەریـــا بـــەدەم ســـەگ ئـــەڵێن پـــیس نابـــێ
گـــــەورەمان بەســـــیما و بـــــەریش نابـــــێ
زۆر هـــــات قەواڵـــــە گشــــتی بەتاڵــــــە
گـــوڵ نەپچـــرێتن سســـت و ســـیس نابـــێ

هەولێر
٢٠١٥/٥/٢٤

## مارانگەز

خششـــەی گـــوریس هـــات مارانگـــەز هـــەڵات
تـــاکو رزگاربـــێ، لـــەم ترســـەی کـــەهات
ترســــــەکەش ترســــــی مـــــار پێوەدانـــــە
کـــەپیلان دەرچـــو بـــۆی بکـــە خـــەبات

هەولێر
٢٠١٥/٥/١٩

## سەرچۆپی

بوارمـــان دا بەســـەگ، سەرچـــۆپی بگـــرێ
تـــاکو بـــزانین، چ ڕێیـــەك ئـــەگرێ
بـــۆ لای ســـەبەتەی نـــان ڕۆیـــی خێـــرا
تـــاوەکو تێـــر بێـــو وە وازو نـــەمرێ

هەولێر
٢٠١٥/٤/٣٠

## قسە

ئـــەڵێن کەقســـە کەوتـــە زارەکـــی
گومانـــت نـــەبێ کەوتـــە شـــارەکی
پەنـــدی پێشـــینان هـــەموویان ڕاســـتن
گشـــتیان کاریگـــەر بەیـــەکجارەکی

هەولێر
٢٠١٥/٦/٣

## کەبویە ڕێوی

لمـــوز نزمبـــە، بەرامبـــەر کەســـان
لـــەخۆ دەرمەچـــو، هـــیچ کـــات بێوچـــان
ســـەر و قـــون کـــەراش ئـــەمو ئـــەو مـــەخۆ
کـــەبێ مننـــەتکرای، لەپەخشـــی زیـــان

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٠

## گرێی دەست

نەكـــــەی گـــــرێی دەســـــت بخەیتـــــە ددان
كـــــارت ســـــاناكە، تـــــا بـــــڕوا ئاســـــان
كـــــاری ئـــــەنجام درا بەشـــــانو بـــــازووت
مەیخـــــە ددانـــــت، ئـــــەبی پەشـــــیمان

هەولێر
٢٠١٦/٩/١٤

## مێش

مـــــێش ئەچـــــێ لەپیســـــایی ئەنیشـــــێ
عەودالّـــــە لـــــەبۆی ســـــەری بـــــۆی دێشـــــێ
كـــــاری نابـــــەجێ بەئاشـــــكرا دیـــــارە
بـــــۆ پـــــێی ســـــووك بـــــوە؟ لەبـــــەر پەرۆشـــــێ

هەولێر
٢٠١٥/٦/٧

## هەمبانمان مایە

جوارمـــــان خـــــواردووە هـــــەمبانمان مایـــــە
چـــــاكە و ڕووخۆشـــــی پیشـــــەی زانایـــــە
ژیـــــان هاوكـــــاری وەڕێزلێنانـــــە
كـــــارت لـــــەجێبێ، دەنـــــا گومڕایـــــە

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٠

## خۆهەڵکێشان

لەشـــاری وابـــی نادیـــار کەســـــنەناس
خـــۆت هەڵئەکێشـــی پـــڕا و پـــڕ بـــەکراس
لەکۆمـــەڵگای خـــۆت، خـــۆت هەڵمەکێشـــە
زیـــادەڕەو مەکـــە، بـــا نەیـــە نـــاو بـــاس

هەولێر
٢٠١٥/٦/١١

## پارووی ناو باغەر

پـــارو بکەوتـــە باغـــەر نـــەوەك کـــۆش
وانەکـــەی ئـــەڵێن گێلـــی وەبـــێ هـــۆش
نەکـــەی لەســـەنگی خـــۆت کەمکەیـــەوە
بەبێگانەشـــــا ببـــــی فـــــەرامۆش

هەولێر
٢٠١٥/٦/١١

## کەچەر

کەچـــەر خـــۆ نـــەبوە حکـــیم لـــەبۆ خـــۆی
تیمـــاری ســـەری خـــۆی بکـــا بـــۆ خـــۆی
جـــێ متمانـــە بـــی، گللـــەییم نیـــە
بـــەڵام ئـــەبینم مـــاڵیو دەســـتەمۆی

هەولێر
٢٠١٥/٦/١١

## بزن

بـــزن بـــا هۆشـــتبێتەوە بـــەر خـــۆت
ناخۆشـــیو تـــاڵی مەخـــە، نـــانو دۆت
نەكـــەی نـــانی شـــوان بخـــۆی تـــێ ئەچـــی
خۆشـــی ژیانـــت ئـــەدەی لەدەســـت خـــۆت

هەولێر
٢٠١٥/٦/١١

## پەتی درۆ

هــــەموودەم پـــەتی درۆ كورتــــە لامـــان
نــــابوت، نــــاڕەوا، شــــێوا، بێوچـــــان
ئـــــەڵێم ڕاســـــتگۆبە لەقســــــەكانت
تـــا شكســـت نـــەبی لـــەماوەی ژیـــان

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٢

## كەری تۆپی

ئـــەبینم كـــەری تـــۆپی جـــۆ نـــاخوات
كەجەنەشـــــی گـــرت ئەچـــەقێو نـــاڕوات
جـــۆڕكی لەســـەر بـــێ پێـــوەی ئـــەخافرێ
ئالیـــك ئـــەخواتو ئـــەزەڕێو ئـــەڕوات

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٢

## زیندوویی

پـــێم ئـــەڵێن فـــلان هێنـــدە زینـــدووە
لەهـــــەزار ئـــاوی داوە تـــــەڕ نـــــەبوە
چـــەند خۆشـــە کـــەوا وریـــا و زیـــرە کبـــی
نـــەك بڵـــێن لـــەهۆش، سســـت و مـــردووە

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٢

## شەرمی چاو

ئامۆژگاریـــــــەکت ئەکـــــــەم بـــــــەتکا
ئـــەڵێن دەو ئـــەخوا چـــاو شـــەرم ئـــەکا
کەواتـــــە نەکـــــەی قرچـــــۆکو تونـــــدبی
وابـــــی، بـــــەجارێ، کەســـــیەتیت شـــــکا

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٢

## پاروو

هـــــەلێکت دیـــــوە، تـــــۆ کەوتیـــــە شـــــوونی
پاروەکـــــەی دەســـــتت، کەوتیتـــــە ڕوونـــــی
هەرکـــەس، حـــەز ئـــەکا کـــەوای لـــەبۆ بـــێ
دووریـــــش بـــــێ لەبرســـــیەتی و دژونـــــی

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٢

## کەری لێ بکەوی

فـــــلان شـــــوێن خێرینیـــــە و چـــــەقێنە

چـــــی لێ شـــــین نـــــابێو وشـــــکو خورێنـــــە

کـــــەر بکـــــەوێ لێ ی ددانـــــی ئەشـــــکێ

بـــــەلاوەی مـــــەنێو، دار لێـــــی بچـــــێنە

هەولێر

٢٠١٥/٦/١٢

## ئەم ماستە

ئـــــەڵێن ئـــــەم ماســـــتە مـــــوەکی تیایـــــە

هـــــەر بـــــێ هـــــۆ نیـــــە، ئـــــەم کـــــارە وایـــــە

هـــــەر کـــــارێ بیکـــــەی هـــــۆی خـــــۆی تیایـــــە

بزانـــــە ســـــوودی زۆری بـــــۆت مایـــــە

هەولێر

٢٠١٥/٦/١٣

## نانی بێ خوێ

فـــــلان نانەکـــــەی ئـــــەیخوا بـــــێ خوێیـــــە

ژینـــــی تێـــــك ئەچـــــێ لەبـــــەر ئـــــەم هۆیـــــە

بـــــا کـــــار و پیشـــــەت لەئاســـــت خۆیـــــا بـــــێ

تـــــا خـــــەڵکان نـــــەڵێن ئەنجامـــــدەر کوێیـــــە؟

هەولێر

٢٠١٥/٦/١٣

## مار

مـــار بەتـــەنیا خـــۆی بـــەکونا ناچـــێ
وا گەڕەشـــــکەکیش بـــــەدواوەی ئەچـــــێ
هـــەموو شـــت بەنـــده بەدەســـتووری خـــۆی
کـــاری وا مەکـــــە لەســـــنوور دەرچـــــێ

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٣

## لەمشکا

ئـــــەوی لەمشـــــکا ببـــــێ دڕ ئـــــەبێ
نزیـــك هـــــەمبان بـــێ، هـــــەمبان دڕ ئـــــەبێ
ئـــــــازایی دیـــــــاره لەڕەچـــــــەڵەکا
چوســـــته لـــــەڕێگاش هـــــەر قـــــەدبڕ ئـــــەبێ

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٤

## کاسەی پڕ

ئاشـــــتی گشـــــت ماڵێـــــك کاســـــەکی پـــــڕه
بۆیـــــان گونجـــــاوه، خۆشـــــه و جێگـــــره
باغـــــەر گـــــەرم بـــــێ تـــــا ڕاده دیـــــاره
هەســـــت پـــــێ نەکـــــەری گێـــــل و مـــــل وڕه

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٤

## جۆخین و دۆخین

دەوڵەمەنـــــد هـــــەوڵی لــــــەبۆ جۆخینـــــە
هــــەژاریش خولیـــــای هـــــەر لەدۆخینـــــە
تـــــۆش بـــیر کــــەرەوە و هــــەڵی ببـــــژێرە
مــــــام ناوەنـــــــد لـــــــەنێوانیان ببینـــــــە
ســــەروەرمان فــــەرمان ئـــــەدا ناوەنـــــد بـــین
گوێڕایـــــــەڵی بــــــــە تیمـــــــاری برینـــــــە

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٤

## حوشتر ڕاگرتن

ســـــەر دەرگـــــام بۆیـــــە بڵنـــــد کـــــردووە
چـــــــــونکە حوشـــــــــترم وا ڕاگرتـــــــــووە
هـــــــەر کــــــارێ ئـــــــەنجامت دا بزانـــــــە
چـــــی ئەکـــــەی، نـــــەزان وەکـــــو مـــــردووە

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٤

## کەسەر چوو

ســــــەر بچــــــێ مـــــاڵیش بــــەتاڵان ئەچـــــێ
وەك شــــــیوی نیســــــك، خێــــــرا هەڵئەچــــــێ
ســــــەر، ســــــەڕافەتی ماڵەکــــــەی ئــــــەکا
کەسەرچــــــو ڕۆیــــــی، مــــــاڵکێوە ئەچــــــێ؟

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٤

## مانگەشەو

مانگەشەو دیارە سەر لەئێوارە
ئەوەی تێناگا لەخۆی بێزارە
کارت لەجێ بێ تاخۆشەویست بێ
گێلیش زمانکورت، وەشەرمەزارە

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٤

## بۆ ئەڵێم کاکە

بۆ ئەڵێم کاکە، کێشکەم بۆ بگری
دڵسۆز بی بۆما لەسۆزا بگری
بێیەوە سەر ڕێ ڕێی سەختم ببڕی
لەناخۆشیا دەستەکەم بگری

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٤

## میوانی سەعاتێك

میوان یەك سەعات وەك کامێرەیە
پێم باوەڕبکە، مەڵێ بۆ وەیە؟
ڕازی خۆت بۆ کەس بەزوبان مەڵێ
با نەڵێن کەوتە ناو ئەم هەڵەیە

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٤

## بڕوانە

بڕوانـــــــە وا کـــــــەر لەکوێکـــــــەوتووە
تێبینــــــی بکــــــە ئــــــەڵێم نوســـــتووە
چـــــونکە کوندەکـــــەش لـــــەکوێ دڕابـــــێ
شـــــوێنەوارەکەی بەرچـــــاو زینـــــدووە

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٥

## هەموو شت بەخێ

هــــەموو شـــت بـــەخێ خێکـــەش بـــەمانا
بـــــەم شـــــێوە بـــــڕۆ بـــــەبیر و توانـــــا
کـــارت ئـــــەنجام دە، وەك کەســـــی دانــــا
تـــا بـــۆ کەســـــنەبەی، پـــــەنا وەهانـــــا
چـــــونکە چ پـــــەنا وەیـــــاخۆ هانـــــا
بـــۆ (خوایـــــە) خـــــاوەن هێـــــزە وەتوانـــــا
(توانـــــای بەتـــــەنیا)، لەهـــــەموو بارێـــــك
(پـــــەروەردگارە)، (پاکـــــە وەزانـــــا)
بەنـــــدەی بـــــێ توانـــــا، ســـــەرێ هـــــەڵبڕە
نەکـــــەی بنـــــازی، بـــــەبازوو شـــــانا
بـــەس ئـــەوی (خـــودا) مـــەیلی لەســـەربێ
هـــی تۆیـــە، ئەندێشـــەت مەینـــە ژانـــا
هـــەر کـــارێ بیکـــەی، (مـــام ناوەنـــدی) بـــە
ئاشـــــکرایە فـــــەرموودەی ســـــەروەرمانە

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٥

## کورِ

کـــــورِ جێگـــــەی بـــــاوکی زو ئەگرێتـــــەوە

ڕەوشـــــتی باوکیشـــــی، ناســـــڕێتەوە

مـــــاڵیش بـــــەماڵخۆ ئەچـــــێ وەك ئـــــەوە

نـــــەزان نازانـــــێ وایـــــە لەخـــــەوە

هەولێر

٢٠١٥/٦/٢٣

## کەری قەسری

کـــــەرێ بقەســـــری هـــــەردەم ســـــەرمایتی

گـــــەرم نابتـــــەوە و سەرماشـــــی مـــــایتی

لەســـــاڵدا دوو جـــــار، گـــــەرم ئەبتـــــەوە

ئـــــەڵێی نەخۆشـــــە، وەلـــــەرز و تـــــایتی

هەولێر

٢٠١٥/٦/٢٢

## تا سەر بمینێ

راســـــتە کـــــە ئـــــەڵێن تـــــا ســـــەر بمینـــــێ

ئـــــەویتر هـــــەر عاجبـــــاتی ئـــــەبینێ

جێگـــــەی هـــــەر پەنـــــدێ دیـــــارە هـــــەموودەم

ئـــــەتۆش ئـــــەم پەنـــــدەت لـــــەبیر بمینـــــێ

هەولێر

٢٠١٥/٧/١

## زەرەر

هۆش بەکاربێنە، بیر بکەرەوە
زەرەر لەنیوەی بگەڕێتەوە
بەسەر کارەکەت، بتوانە زاڵبە
ئەوەی وانەکا ناحەسێتەوە

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢١

## چاوی لەدەرێ

بیستوومە دەڵێن چاوی لەدەرێ
تۆ بەتەمای چی؟ خۆری تێ وەرێ
راست نین و هیچ کات، پێیان هەرمەرێ
یەك دوا لێیان، بڵێ چ مەڵێ

هەولێر
٢٠١٥/٦/٣٠

## بوکێ لەگەڵ تۆمە

بوکێ بۆ تۆمە، خەسو گوێت لێ بێ
بۆ خەسوی دانا، ئاڕاستەك ڕێ بێ
قسان بکوڵێنە، ئینجا بیبێژە
ئەی خەسو قسە و کارت لەجێبێ

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٧

## دەست توندی

گیـا لــەجێی عاســێ و ســەخت شـین ئـەبێ
نـــەزانی گـــومڕا زو بـــێ دیـــن ئـــەبێ
ســـەر دەرگـــا بڵندکـــە حوشـــترت هـــەبێ
کارســـــازی زانـــــا جێگـــــرت ئـــــەبێ

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢٧

## قەل دەقڕێ

کەســـــێ زمـــــانی بەقســـــەی نـــــاخۆش
بێتـــــــە دوان و نـــــــەتکا فـــــــەرامۆش
ئـــەڵێن فـــلاَن کـــەس وەکـــو قـــەل دەقـــڕێ
تـــۆش بـــۆی مەســـازێ و مەبـــە جگـــەرگۆش

هەولێر
٢٠١٥/٦/١٧

## سەگ بەسەگ بگرە

لەهەنـــدێ هەڵوێســـت ســـەگ بەســـەگ بگـــرە
وانەکـــەی کـــەس گوێـــت نـــاداتێو بمـــرە
چـــونکە هەنـــدێ کـــەس ئیمـــڕۆ وەهایـــە
لێـــــت لەگێچـــــەڵە، پـــــارێزی بگـــــرە

هەولێر
٢٠١٥/٦/٢١

## لەژێر کراس

هـــەر کەســـێ لـــەژێر کراســـی خـــۆی پیـــاوە
ئـــــەوەی تـــــێ ناگـــــا گێلـــــە وەخـــــاوە
بـــــێ لێکدانـــــەوە، زیـــــادڕەوی مەکـــــە
هەرکـــەس ڕێـــزی خـــۆی پێـــدە تـــا مـــاوە

هەولێر
٢٠١٥/٧/١٢

## چەپڵە

چـــەپڵە بەیـــەك دەســـت هـــەر لێ نـــادرێ
باڵنـــدەش بەیـــەك بـــاڵ، هـــەر نـــافڕێ
دوو قاچـــو دوو بـــاڵ بـــۆ یـــەك ئەســـازێن
لـــــەبارن بـــــۆ مـــــەڵ، دواش نـــــاخرێ

هەولێر
٢٠١٥/٨/٤

## کۆر بەکۆر ئەڵێ

کـــۆر بـــەکۆر ئـــەڵێ ئیمنـــت بـــەلا چـــاو
دەروون کـــەتێك چـــو پێـــی دادێ زاخـــاو
دیـــارە ئـــەم قســـەش پـــێ هەڵبڕینـــە
ئـــەم عەیبـــەت هـــەبێ، کەسمەخـــە نـــاو داو

هەولێر
٢٠١٥/٨/٦

# دۆم بەدانیشتن

دۆم بەدانیشتن ماڵی وێرانە
چونکە کارکردن خۆشی ژیانە
دۆم بۆ ناو نرا بەم نازناوەیە
گەلێ پێویستی بەهەوڵدانە
هەوڵەکەش هەر کارکردنە لەبۆی
نەوەك سوارکردن پێی پەرێشانە
حاجی فەرموویتی دەستت ماندووبێ
زگت تێر ئەبێ سەرکەوتوانە
تۆش کۆشش بکە سەرمەشقی ژینت
تا دڵت خۆش بێو دووربی لەتانە
ئەوەی نان خۆری جێگر بێ هەردەم
لەژینیش دابی وەکو نەمانە
دەستێ ببەخشێ بەرز و بالآیە
دەستێ وەرئەگرێ لەداڕمانە
(خوایە) نەمان کەی بەدەستی زەبوون
ئەویش حەز ناکا لێی درێ مەهانە
گەورە و بەخشندە (هەر تۆی) بۆ گشتمان
سەرفرازمان کەی لەئەم جیهانە

مەبەست لەحاجی، حاجی قادری کۆییە.

هەولێر

٢٠١٥/٧/١٨

## بەرهەم

بەرهــــەمی هـــەوڵت گـــەر بـــۆ خـــۆت نـــەخۆی
ئـــــەڵێم ناشـــــیاو، نەیبـــــەیو نـــــەڕۆی
کـــــێ کردیـــــو، ئێســــــتاکەش بـــــەکێڕا
چـــی ئەکـــەی؟ ئـــەبێ دەســـت لـــەخۆ بشـــۆی

هەولێر
٢٠١٥/٨/٦

## بێ ڕووەت

بـــــێ ڕووەت، لـــــەلای خـــــەڵکان، ڕیســـــوایە
کـــــەس لەهەڵوێســــــتی، بـــــەهانای نایـــــە
بیســــتوومە کـــەوا، کـــەس گـــوێی ناداتـــێ
هـــــەروا ئـــــەبێتن تـــــا ژینـــــی مایـــــە

هەولێر
٢٠١٥/٨/٨

## جیسکی هەیاس

ئیمڕۆکـــــە چـــاوم بـــوە گیســـــکی هـــــەیاس
هەنـــدی گـــوێ بگـــرم مـــن لـــەدەنگو لـــەباس
ئـــــــارامم نـــــــەما، دڵـــــــم ڕاڕابـــــــو
لەقســـــە بیســــتن، مێشـــــکم بـــوە کــــاس

هەولێر
٢٠١٥/٨/١٠

## بڕوام پێ بکە

بڕواکــــە مــــەڵێ، ئەکـــەی باســـی چــــی
بــەس ئــەم نانــەم خــوارد، کــەتۆ لێــرە نــی
ئەمــــەش واتایـــــە، بـــۆ بێـــــزاری مـــــن
لـــــەخودی تـــــۆوە، نـــــەك لەیـــــەکی دی

هەولێر
٢٠١٥/٨/١٠

## دارێکم پێیە

ئێســـــتاکە، داری، دوو ســـەر پـــیس ئـــەگرم
لـــەداخو حەســـرەت، هـــەر وەختـــە بمـــرم
نـــازانم چـــی بکـــەم، دەســـت بەهـــەر لایـــەك
بگـــرم دەســـت پیســـم، مـــن بەچـــی بخـــوڕم

هەولێر
٢٠١٥/٨/١٠

## کەخەنە زۆر بو

ڕەوایـــــە، مافتـــــە، بکـــــەی تـــــەگبیرێ
خەنـــەی زۆر، لـــەجێی وەهـــا ئـــەگیرێ!
بـــەس نیـــە! چـــیتر، شـــتی تـــر، مـــەکڕە
هەنـــــدەت کڕیـــــوە، پـــــێم هـــــەڵناگیرێ

هەولێر
٢٠١٥/٨/١٠

## سواری کەر بوە

سواری کەر بوە، لەکەر ئەگەڕێ
بۆیە چی بڵێم، پێم ئەڵێ بەڵێ
ئەمەی ئەیەوێ، لەناو دەستی تی
پێشی ناخۆشە، یەکێ وەبڵێ

هەولێر
٢٠١٥/٨/١٠

## حوشتر خەت

بەحوشتریان وت، بڕۆ حوشتر خەت
لەوەڵام گوتی پیشەم نەبو قەت
هەرکەس بەپیشەی خۆی گرفتارە
کەشایستە بو، پێی بدە مەوڵەت

هەولێر
٢٠١٥/٨/١٠

## زگی برسی

کەنەت بو زگیشت ئەبێ برسی
هەتا تێر نەبی، لەهیچ ناپرسی
پێت ئەڵێم هیچ کات گازاندە مەکە
لەمەی برسی یە، جێی ترسە برسی

هەولێر
٢٠١٥/٨/١٠

## درۆزن

درۆزن ئاگریشی لەماڵیا بەربێ
ئەڵێن وا بەدرۆ، لەزاریا دەردێ
درۆزن بێ سەنگە، لەناو کۆمەڵدا
لەشەرمەزاریا، وای لێدێ، هەردێ

هەولێر
٢٠١٥/٨/١٠

## خەیاڵی جیاواز

بیستوومە ئەڵێن ئاش لەخەیاڵێ
ئاشەوان هەروەك وی، لەخەیاڵێ
کەسیان ئاگایان، لەکەسیان نیە
یەکیان لەحاڵێ و، دووەم لەحاڵێ

هەولێر
٢٠١٥/٩/٩

## شیر تیژی

چونکە لەشەڕ نی شیرەکەت تیژە
دەروونت زلە و خۆت لا بەفیزە
کەسێ ڕەسەن بێ، نەریتی جوان
پەیڕەو ئەکات و، ئەیکا بەپیشە

هەولێر
٢٠١٦/١٠/١٥

## لەپێش تایَ

تـــۆ لـــەپێش تــایَ بــەڕ بــەخۆ دادە
پێــت ئــەڵێم ڕاکــە گــورج بــە و واکــە
بەزانســـتانە کـــارت ســـانا کـــە
وابکـــەی خـــۆت تێئەگـــەی وا چـــاکە

هەولێر
٢٠١٧/١٢/١٣

## لەسێبەری خۆت

مەترســـە و فڕێیـــدە ڕەوشـــتی بۆگـــەن
تـــا ســـێبەری خـــۆت، لێ نەبتـــە دوژمـــن
کەســـێ، نەترســـو، ئـــازا و چـــاپووک بـــێ
خۆشـــی ژیـــانی، هـــەر لێ نابـــێ ون

هەولێر
٢٠١٦/١١/٥

## مەڕ

مـــەڕ لەســـەر قەســـاب مـــردار مەکـــەوە
ئەنجامـــدەر نـــەك بـــۆرژاو هـــەر لەخـــەوە
کارێکـــت بـــۆ هـــات، بەراســـتت زانـــی
بـــێ قەســـاب لـــەناو دڵـــت جـــێی کـــەوە
چـــونکە کـــاری بـــاش، ئـــەبێ ڕاپـــەڕێ
ئەنجامـــــدرێ، ئـــــاوی لێ مـــــەخۆرەوە
چـــاوەڕێی گەمـــژەڵ مەکـــە یاریـــت کـــا
خـــۆت بـــەجێی گەینـــە، لـــەم تـــەوەرەوە
خورشـــتی دەســـتی خـــۆت بـــەخۆت ئەشـــکێ
کەســـێ خـــۆی ئاســـوودەکا پێشـــڕەوە
مـــەڕت ســـەربڕە، کـــارت ســـاناکە
پـــەرێز لەقەســـاب بکـــە و، دوورکـــەوە
کەســـێ کـــاری خـــۆی، لـــەخۆی ئاڵۆزکـــا
ڕۆژێ روونـــاکی، لـــەدڵی شـــەوە
دەوەرە، راســـت بـــە و، لـــەلاڕێ مـــەڕۆ
کـــەی بـــەئاگا دێـــی، لـــەم ڕێـــڕەوە

هەولێر

٢٠١٦/٩/٢٧

## کەری سەرکێش

کـەر نەچـتە بـەر بـار، بـار ئەچـتە بـەر کـەر
لێـت ئـەبێ بەشـێر، دات ئـەنێ بەمـەڕ
جەنـــە گـــرتنیش، لـــەکاتی وەهـــا
بـــۆ (کـــەرە) ئەبتـــە، ســـووکی لـــەم تـــەوەر

هەولێر ٢٠١٦/٩/٢٨

## قسەی وا هەیە

قســـــەی وا هەیـــــە، نابــــێ بیبێـــــژی
دەنــــا تــــالاوی، مــــــەرگ ئەچــــێژی
ئــــاو لـــــەدوا ڕێچــــکەی وا بـــۆ ئەڕێـــژی؟
بێـــــدەنگ بــــی لــــەلام، گـــــەلێ بــــەڕێزی

هەولێر
٢٠١٦/١١/١٨

## دەڵێی چرای دزە

هەنــــدێ جـــار گڵـــۆپ، لامپـــا، بێـــوزە
هەنـــدە بـــێ شـــەوقە، ئـــەڵێی چـــرای دزە
پـــێم ناڵـــێی چـــرای دز لـــەبۆ بـــێ شـــەوقە
دز شـــــــــــەرمەزارە دوورە لـــــــــــەبزە
بـــــــزە تەنانـــــــــەت زەردەخەنەیـــــــــە
دز گوێشــــــی گرانــــــە ئـــــەڵێی پرمــــــزە
دز چـــــرایەکەی خـــــۆی وەهــــا دائـــــەنێ
بـــــۆ ســــــــەرکەوتنی پلانــــــی کـــــــزە
دەروونــــــی نــــــزم هـــــەموو شــــت ئــــەکا
بــــــەڕووی دانایـــــە خەنــــــدە یـــــا بـــــزە

هەولێر
٢٠١٧/١/٣١

## باڵی مێروو

(خـــوا) کــەباڵی دا بـــەمێرووی بـــێ هێـــز
لـــەخۆی دەرئەچـــێ، وەکـــو کـــەری دێـــز
دیـــارە وا باشـــە، مێـــروو بـــێ بـــاڵ بـــێ
تـــا لەماڵەکـــــەی وەربگــــرێ چــــێژ
سوپاســــگوزاری، کـــاری (خـــودا) بـــە
چـی پـێی بەخشـی پێـت لات بـاش بێـو بـەپێز
دڵنیـــام کـــە (خـــوا)، کـــاری لەجێیـــە
بڕوانـــە کـــاری (خـــوا) بەچـــاوی ڕێـــز

هەولێر
٢٠١٧/١/٢١

## سەگ بەئەمەکە

ســـەگ خاوەنەکـــەی هـــەموودەم ئـــەوێ
بـــێ ئەمـــەك نیـــە و پێیـــا نـــاڕەوێ
بـــەلام بـــۆ خـــەڵکان پـــارێزی ئـــەوێ
چـــیبکەی نەتناســـێ لێـــت ئەکـــەوێ

هەولێر
٢٠١٧/٦/٢٨

## کەدارت هەردا

کـــــەدارت هــــــەردا ســــــەی دز دیــــــارە
ئــــــەت گۆڕێتــــــەوە، بـــــەپوول و پــــــارە
بەبەهانـــــــــەی درۆ، لێشـــــــــت بێـــــــزارە
بۆیـــــــە لەئاســــــتت وەك مــــــارە هــــــارە

هەولێر
٢٠١٧/٧/١٢

## قەسپەکەی ئەی خۆی

ئـــەو قەســـپەی ئـــەی خـــۆی نـــاوکی لای منـــە
لـــــێم بشـــــاریەوە، تـــــۆم لا دوژمنـــــە
لـــــەکاری پـــــەنهان ڕازی تـــــۆ ونـــــە
قـــاچ لـــەناو زگ بـــی، نموونـــەت چـــنە؟

هەولێر
٢٠١٧/٦/٢٨

## کەمخواردن

کـــــــەمخواردن لـــــــەبێ دەســـــــەڵاتیە
ئـــــەبێ وابکــــــەی هــــــیچ چـــــارە نیـــــە
بەقـــــەد بەڕەکـــــــەت پــــــێ ڕابکێشـــــە
بەجێهێنــــــــەری، پیــــــــاوێکی دیــــــە

هەولێر
٢٠١٧/٦/٩

## کڵاوی خوار

بیستوومه بەدوو کڵاوی خوار کەوتی
کارت ڕاست نیه، تا بڵێی چەوتی
بەهەموو قسان، نەکەی باوەڕکەی
هەرکاتێ وابی، بێ ئاگای خەوتی

هەولێر
٢٠١٧/٥/٢٩

## بەکوچەکەرێ

بەکوچە کەرێ، زستانمان ناڕوا
ڕەقئەبینەوە، پێم بکە بڕوا
(یاخوا) داوەشێ، (خوا) بەکەمی کا
هەر بەبێبەها، لێی دا لاق شا

هەولێر
٢٠١٧/٧/١٢

## تا دووری پووری

بیسـتوومه کـەوا تـا دووری پـووری
کـەزۆر تێکـەڵ بـوی، ترشـی وەسـووری
بەپێچـەوانەی وەش لەگـەڵ ڕەسـەن
هـەر چـۆن بـی، لایـا مەنـدی مەسـتووری
دە تـۆش زیـاتر لەگـەڵ ڕەسـەنا
تێکـەڵ بـە هەسـت ناکـەی بەمەغـدوری
ڕەسـەن خـۆی پیـاوە، باوکیشـی پیـاوە
بەرهـەم وەك تـۆیتی، لێشـت ئـەبووری

هەولێر
٢٠١٧/٧/١١

## مەڕ لەسەر قەساب

مـەڕ لەسـەر قەسـاب مـردار مەکـەوە
کەسـێ وائـەکا، دیـارە لەخـەوە
خۆشـە نەشـێوێی پـێش خـۆش ببینـی
کەنـەت دی، لـەلات تاریکـە شـەوە

هەولێر
٢٠١٧/٩/٢٣

## سەنگی بەرد

ئـەڵێن بـەرد، لەجێگـەی خـۆی بەسـەنگە
کەسـێ جـێ لـەق بـێ، پەسـتە، روو تەنگـە
کـەجێگیریش بـو، دڵ لەئاهەنگـە
نـەدۆڕێی، دۆڕاو، گـەڵ بـێ ڕەنگـە

هەولێر
٢٠١٧/٩/٢٠

## نانی شوان

بـــــزن نــــــەیرانی، ئـــــەرکی بڕوێنــــــی
لەئـــــــەنجام کۆتــــــا، بــــــەژینی دێنــــــی
کــەی وەهــای لێ هــات؟ نــانی شــوانی خــوارد
کـــار لــــەکار تـــرازا! چــــی لــــەبۆ دێنــــی؟

هەولێر
٢٠١٦/١٠/٢٧

## بەپێتوند بگرە

بـــەپێ تونـــد بگـــرە بـــێ پـــێ ئـــی خۆتـــە
خـــۆ گـــەر وانەکـــەی هـــەر گۆتـــە گۆتـــە
کــــردەوە و کـــارت بــــەڕێو جـــێ بـــێ
بـــێ پێچـــی ئـــەکا! وەك مـــوڵکی خۆتـــە

هەولێر
٢٠١٨/٩/١٣

# دان بەهەڵە نان

دیزەیـــــەك بشـــــكێ لەلایـــــەن کابـــــان

هـــــەر تەققـــەی نایـــە و ناهێنـــێ زیـــان

بەدەگمـــــەن خـــــەڵك دان بەهەڵـــەی خـــۆی

-ئـــــەهێنێ لـــــەخۆی تـــــاڵ ئـــــەکا ژیـــــان

چـــونکە پـــاش هەڵـــە کـــەدانت پیـــا نـــا

پایـــەت بڵنـــد نابـــێ لای کەســـی نـــەزان

بـــەس هۆشمەنـــد لەهەڵوێســـتیا ئـــەڵێ

ئـــەم کەســـە ڕاســـت گۆیـــە کـــاتی دوان

بـــا ئێمـــەش عـــەیبی خۆمـــان نەپۆشـــین

بـــا لـــەپێش چـــاوان خۆمـــان کـــەین جـــوان

ژمـــارەی کەســـی وا گـــەلێ کەمـــە

بەپەنجـــەی دەســـتا ئـــەژمێردرێ ئاســـان

پیـــاوی مـــەرد راســـتە و لێیـــا لانـــادا

ڕوی تێکـــەی ناوەســـتێ دەســـتە وەســـتان

هەولێر

۲۰۱۸/۱۲/۲۷ پێنج شەممە

## نه کردیو نه خواردی

نـــه کردیـــو نـــه خـــواردی کردتـــه پەلـــه
لــــەسمێل هــــەڵت ســــووی لــــەم هەڵــــه
کەســـێکی وای کـــرد تـــا بڵێـــی کـــەره!
گێلـــــه هەربۆیـــــه هـــــەر لـــــەزەرەره

هەولێر
٢٠١٩/٢/٨ دووشەممه

## نەزان

نــــــــەزان کەوتووتــــــــه زەڕ و زەرەرێ
بـــــەڵام ئاشـــــەکەی لای (خـــــوا) ئەگـــــەڕێ
بـــۆ وایـــه؟ چـــونکه (خـــوا) زەیـــی زۆره
یـەك (خـوا) پشـتی بـێ، تـۆش چـی پـێ مـەڵێ

هەولێر
٢٠١٩/٢/١٨ دووشەممه

## لەکوێوە پسا

کەســـێ هـــەر لــــەهیچ بـــیر نەکاتــــەوه
ڕۆژی رووناکیشــــــی، بــــــۆ ئەبتــــــەوه
ئـــەم کەســـه گێلـــه بۆیـــه پێـــی ئـــەڵێن
لـــەکوێ لێـــت پســـا، تـــۆش گـــرێی دەوه

هەولێر
٢٠١٩/٢/١٨ دووشەممه

## کەتۆ بێ پێ بی

کـــــەتۆبێ پێبـــــی بـــــۆ کوێـــــوە ئەچـــــی؟
پێـــت نیـــە ئـــەڵێم چـــۆن چـــۆن دەرئەچـــی؟
چـــــۆن لەزســــــتانا ئەگـــــــەی بەبــــــەهار؟
بـــەپێی کووچـــە کـــەر، گیانـــت دەرئەچـــی

هەولێر

٢٠١٩/٢/١٨ دووشەممە

## پێ لێهەڵبڕین

پـــــــێ هەڵمـــــــەبرە لــــــەکارو پیشـــــــەت
بـــــــادەر نەچـــــــێتن لەڕەگاریشــــــــەت
ڕیشـــەی کەســـیەتیت جـــێگیر بـــێ باشـــە
تـــــا نـــــەڕوخێتن لێتـــــا متمانـــــەت

هەولێر

٢٠١٩/٢/١١ دووشەممە

## ڕوو مەشکێنە

پـــــڕ دەبتـــــەوە، جێگـــــەی خەنجـــــەران
بەســـــڕەش نابتـــــەوە قـــــەت ڕوو شـــــکان
هـــــەر نـــــاڕواتن لـــــەدڵ بـــــێ گومـــــان
شـــــوێنەکەی دیـــــارە لـــــەماوەی ژیـــــان

هەولێر

٢٠١٩/٣/٧ پێنج شەممە

## تێ نەکەوی

بــــەهیچ جـــۆر کوچـــك نابـــێ بــــەئاگر
کوچـــك هـــەر نـــەبێ، بـــۆت بەسســـە ئـــاگر
کەکوچـــت هـــەش بـــێ، پـــێ نـــەبی بـــاغر
پـــێی بـــاغریش بـــی، هـــەر تـــێ ناگـــەی فـــڕ

هەولێر
٢٠١٩/٣/٢٢ هەینی

## زگی تێر

زگـــــی تێـــــر ئاگـــــای لەبرســـــی نیــــە
هاوســـەر تێـــك بگـــەن هـــیچ ترســـی نیـــە
هـــاوژینیش لـــەدڵ وەك یـــەك بـــن باشـــە
ئـــەنجامی گشـــت هـــەوڵێ، کورســـی نیـــە

هەولێر
٢٠١٩/٧/١٥

## کار نەکەر

دۆم بەدانیشـــــــتن مـــــــاڵی وێرانــــــــە
کـــار نەکـــەر هـــەردەم هـــەر ســـەرگەردانە
زمـــــــانی کورتـــــــە وەپەشـــــــیمانە
مووشـــــە خـــــۆرێکی مـــــاوەی ژیانـــــە

هەولێر
٢٠١٩/٧/١٩

# کۆر

کـــــۆرت[1] هەڵنـــــەگری لێتئـــــەبێ بـــــەبار[2]
کـــەلێت بـــو بـــەبار[3] ژینـــت ئـــەبێ تـــار[4]
بـــۆ ژیـــن تـــار ئـــەبێ پایـــەت دێتـــە خـــوار
بـــار بـــۆ ولاغـــە ژێـــر قاچیشـــی نـــار

(١) ئەم کۆرەیە کەئادەمیزاد هەڵی ئەگرێ.

(٢) ئەم بارەیە کەولاغ هەڵی ئەگرێ.

(٣) ئەم بارەیە کەولاغ هەڵی ئەگرێ.

(٤) سووك ئەبی و پایەت دێتە خوار.

هەولێر

٢٠١٩/٧/١٩

# هاوکاری خودا

هاوکار و پشتی سەرەتا و کۆتام
(خوا) بو هاوکاری بەخشی بەڕێگام
سوپاسگوزاریم (بۆی) تەواو نابێ
بەندەیەك دڵسۆز بێ ئەبێ وابێ
لەپاش تۆماری هۆنراوەکانم
دەرئەبڕم بەدڵ وەبەزوبانم
هاوکاری ئێستا و هاوکارم کۆتام
بەتەنیا (خوا بو) کە پێی دام ئەنجام
زیندوبم و مردوو هەر (سبحان الله)
ئەبێژم هەر قەرزارتم بە (والله)
ستایشو سوپاس شایانی (تۆیە)
ژینو نەمانو گیانم هی (تۆیە)
(خوامی) زەییی (خۆت) پێمبەخشی (گەورەم)
بەبەهەشت شادمکەی دووربم لەغەم
چاوم لەبوورین، چاوپۆشی (تۆیە)
ئەگینا (ساڕێژ) هەر ڕەنجەڕۆیە
بەڵام دلشادم، (خوا) زەییی زۆرە
زەییی و لێبوردەی، زۆر چەشن و جۆرە
لەکۆتا ئاکام مەستمبە (زەییت)
دلشادم خۆشی (تۆم) کەپێ گەییت
هیچ کەس بێ هیوا و، فەرامۆش ناکەی
بەندە ڕاست بێ (بۆت) دڵی ڕەش ناکەی

گەشـــــــــــبینم، دوورم لەڕەشـــــــــــبینیدا
ســـوپاس هـــەر بـــۆ (تـــۆ) هـــەر شـــادم (خـــودا)
بـــــەهاوکاری (خـــــوا) ئەگـــــەم بەئـــــەنجام
ئـــــەنجامی بـــــەدڵ کـــــە لەهەوڵـــــدام
توانـــا و هێـــز لـــەلای (خـــوای بەخشـــندەیە)
لەخۆشـــــــی (خـــــــودا) ڕووم بەخەندەیـــــــە
گوشـــادم (ســـاڕێژ) ئیمســـالی نـــەك پـــار
خۆشـــــتربێ بـــــیر و ڕای بـــــەدڵ نـــــەك زار
ســـوپاس بـــۆ خـــودا کۆتـــایی پـــێ هـــات لـــە

هەولێر

٢٠١٨/١١/٧

## ناوەرۆك